- یادداشتەکانم لە کۆماری کوردستان لە مەهاباد
- نووسینی: عەبدوڵڵا ئەحمەد رەسووڵ پشدەری
- پیت چنی و پێدا چوونەوە: مستەفا شێخە
- دیزاین و رووبەرگ: مەزهەر شێخە
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپی دووەم ٢٠٠٩
- هەولێر: چاپخانەی حاجی هاشم

## پێشەکی

پاش ئەوەی بەڕێز عەبدوڵڵا ئاغای پشدەری ئەرکی پیت‌چنی‌و پێداچوونەوەی بەرگی یەکەمی یادداشتەکانی بۆ چاپی دووهەم پێ سپاردم، کاتی خوێندنەوەی ئەم بیرەوەریە بەنرخانە بەبیرم داهات لەسەر ئیزینی نووسەر چەند دێڕێک لە سەرەتای کتێبەکەدا ڕەش بکەمەوە.

بیرەوری یان یادداشت نووسینەوە لە لایەن پێشڕەوانی سیاسی‌و ئەدەبی نەتەوەکانەوە ماوەیەکی زۆرە لە وڵاتانی ڕۆژئاوا دەستی پێکراوە، بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا لای ئێمەو دراوسێکانمان هەندێ لە پێشڕەوان‌و بەشدارانی خەباتی ڕابردوو لە ساڵەکانی کامڵ بوونیاندا بیرەوەریەکانیان بەچاپ‌کراوی بڵاو دەکەنەوە.

بە هۆی ژێردەستەیی‌و تەپەسەرکرانی خەڵکی کوردستان لەلایەن داگیرکەرانەوە زۆربەی ئەو یادداشت‌و بیرەوەریانەی لەلایەن نووسەرانی کوردەوە بڵاو کراونەوە، سیاسین. ئەگەر نووسەر ویستبێتی ژیانی تاکە کەسی خۆشی بنووسێتەوە، ناچاربووە بەشێک لە مێژووی سیاسی‌و خەباتی دوورودرێژی میللەتەکەی بگێڕێتەوە.

بەشی یەکەمی یادداشتەکانی عەبدوڵڵا ئاغای پشدەری زیاتر باس لە کۆماری کوردستان لە مەهاباد دەکات. ئەم پێشمەرگە دێرینەی خەباتی نەتەواتی کە بە خۆشیەوە لە تەمەنی کامڵ بووندا هەروا لە ژیان‌دایە. یەکێ لە پێشمەرگەکانی بەرەی سەردەشتی کۆماری کوردستان‌و لە پێشمەرگە سەرکردەکانی شۆڕشی ئەیلوولە.

نووسەر بە ئەمانەتەوە هەرچۆنێک ڕووداوەکانی دیتووە دەیانگێڕێتەوە. لەبەر خۆ بەزل نەزانین‌و پێداهەڵنەگوتنی خۆی، ئەوەی دیتوویەتی و بەسەری هاتووە وەک خۆی دەیگێڕێتەوە. لەسەرتاپای ئەم یادداشتانەدا خوێنەر هەست بە لەخۆبایی‌بوون‌و زیادەڕۆیی‌و خۆگەورەکردنەوەی نووسەر ناکات. نووسەر

خۆی بە ڕووداوەکان هەڵنەواسیوەو نەیکردوونتە پەیژەی بەرزکردنەوەی کەسایەتیی خۆی.

چاپی دووهەمی ئەم یادداشتانە لە کاتێکدا بڵاو دەبێتەوە کە پارچەیەک لە نیشتمانیەکەمان ئازاد کراوەو زیاتر لە دەساڵە بەشێک لە ئاواتەکانی پێشەوای کورد "قازی محەممەد" لە باشووری کوردستان وەدیهاتووە. نەک هەر خوێندنو نووسین بە زمانی کوردی ئازادە، بەڵکووتاکە چاپخانەکەی کۆمار ئێستا دەیان چاپخانەو رادیۆو تەلەفزیۆنی لە پاش بەجێماوە. بەڵام بەداخەوە زۆربەی کارمەندانو بەڕێوەبەرانی ئەم رۆژنامەو رادیۆو تەلەفزیۆنانە تەنانەت لە ساڵرۆژی دامەزرانی کۆماریشدا کە ئەم رۆژانە پێی نایە شێستو سێهەمین ساڵی دامەزرانی، یادێکیان لەم رۆژە مێژووییە نەکردەوە.

لەم هەلو مەرجەدا کە دەرفەتە بەردەستەکانی راگەیاندنی کوردی بواری ئەوەیان رەخساندووە لە رێگای کەرەستەکانی راگەیاندنەوە مێژووی رابردوومان بە بەربڵاوی بخرێتە بەرچاوی بینەرانو بەرگوێی بیسەران، چاپو بڵاوکردنەوەی ئەم یادداشتانە بە تەواوی لە جێگای خۆی دایە. بەو هیوایە تەمەنی نووسەر درێژتر بێتو بتوانێ بەشێکی زیاتر لە رابردووی دەیانساڵەی تێکۆشانی خۆی بۆ ئێمە بگێرێتەوە. مەبەستی من لە رەشکردنەوەی ئەم چەند دێرە تەنیا وەبیرهێنانەوەیەکە بۆ ئەو بەرێزانەی لە کتێبفرۆشی یان کتێبخانەکان تەنیا لاپەرەکانی سەرەتای کتێبەکان دەکەنەوەو ئەگینا خوێندنەوەی دەقی کتێبەکە زۆر لەوە زیاترە کە پێدا هەڵگوتنی پێویست بێت.

وەرن با ئەوەندەی لەدەستمان بێت، بخوێنینەوەو جارێکیترو جارەکانیتر هەر بخوێنینەوە.

مستەفا شێخە

## به ناوی خودای گەورەو میهرەبان

لەسەر داواو پێشنیاری هێندێ لە هەڤاڵانو برایانی خۆشەویستم هاتمە سەر ئەو بڕیارە، بیرەوەریەکانی خۆمو هەموو ئەو بەسەرهاتو ڕووداوانەی کە بەچاوی خۆم دیتوومن یا بەشداریم تێدا کردوونو لە ناویاندا ژیاوم، وەکو یادداشت بنووسمەوە. بۆ ئەوەی یادگار بێت بۆ پاشماوەکانی خۆمانو بەڵکو مێژوونووسانی کوردیش تا رادەیەک بۆ پڕکردنەوەی چەند کونو کەلەبەرێک لە مێژووی شۆڕشەکەماندا کەڵکی لێوەربگرن.

خۆم دوو شۆڕشی کوردم دیتووەو لە هەردوکیاندا بەشداری چەکدارانەم کردووە. یەکەمیان شۆڕشی مەهابادو پێکهێنانی کۆماری کوردستان لە کوردستانی ئێرانە لەساڵی ١٩٤٦و دووەمیان شۆڕشی ١١ی ئەیلوول بەسەرکردایەتیی مەلا مستەفای بارزانییە کە هەتاساڵی١٩٧٥ تێیدا بەشدار بوومو بەپێی پلەی لێپرسراوەتیم توانیومە ئاگاداری هەموو هەڵسوکەوتەکانی سەرکردایەتی بم.

ئەوەی راستی بێت، من نامەوێت وەکوو مێژوونووسێک مێژووی کورد بە شێوەیەکی بنەڕەتی بنووسمەوەو بەدوای سەرچاوەدا بگەڕێم، بەڵکوو مەبەستی من تەنیا ئەوەیە ئەو ڕووداوانە کە خۆم بەشداریم تێدا کردوون یا ئاگاداریی تەواوم لە سەریان هەیە، بەبێ هیچ زیادی وکەمی بنووسمەوە. لەمەش زیاتر نە خۆم توانام هەیەو نە بارودۆخی ڕۆژگاریش یارمەتیم دەدات.

پێشەکی دەمهەوێ کورتەیەک لە ژیانی خۆمو باوکو دایکمو هەروەها چەند باسێکیش لە چۆنیەتیی دامەزرانی عەشیرەتی پشدەرو جۆری ئیدارەو رابواردنیان بکەم بە بناغەو بنچینەی یادداشتەکانو پاش ئەوە بکەومە سەرباسی شۆڕشی مەهابادو بەشداریی خۆم لەو شۆڕشەدا هەتاکو تێکچوونی بە دەستی ناپاکی دوژمنانی کورد.

## ناو و نیشانی خۆمو عەشیرەتم

ناوم عەبدوڵلا، کوڕی حاجی ئەحمەدئاغا، کوڕی حاجی رەسوڵئاغا، کوڕی قادرئاغا، کوڕی حەمەدئاغای گەورەیە. ناوی عەشیرەتی ئێمە لە هەرێمی پشدەر، میرئاودەل یان میرعەبداڵە. ساڵی ١٩٢٢ی زاینی هاتوومەتە سەر دونیاو لە ناو خێزانێکی تا رادەیەک خۆشگوزەراندا ژیاوم.

خێزانی ئێمە بەگشتیو باوکو دایکم بە تایبەتی زۆر بە ئایینی ئیسلام بەستراوە بوونو هەر لەتەمەنی منداڵییەوە فێری خوێندنی قورئانی پیرۆزیان کردم. لە دواییشدا خەریکی خوێندنی کتێبە ئایینیەکانو هەروەها کتێبەکانی فارسیی وەکو "گولستان"و "بووستان"ی سەعدی شیرازیو چەند کتێبیتری فارسی بووم. جگە لەوانەش هێندێ رێزمانی عەرەبی وەکو "سەرف و نەحو" لای مەلاکانی مزگەوت فێر بووم.

ئەو کاتە هەر زمانی فارسی لەناو کوردەواریدا باو بوو. ئەگەر هاتباو یەکێک زمانی فارسی باش زانیبایە، بە میرزا ناویان دەبرد. میرزایەتی وەکو "دکتۆرا و ماجستێر"ی ئێستە وابوو. راستی من زۆر حەزم لە خوێندن دەکردو دەمویست بۆ دەوام کردن لە قوتابخانەی رەسمی بچمە شارەکانی هەولێر یا سلێمانی، بەڵام باوکم رازی نەبوو و وازی پێ لە خوێندن هێنام. چونکە ئەوکاتە سوارچاکیو تفەنگچیەتی لای خەڵکی عەشایر باشترین شەهادە بوو، بە سواری ئەسپو تفەنگچیەتیەوە خەریک کرام.

باوکو دایکم هەردوکیان خوێندەوار بوون. ئەوانیش هەر دەرسی فارسیان خوێندبوو. دایکم ناوی "مرۆت" کچی عەبدوڵلای رەسووڵ ئاغا، ئامۆزای باوکم بوو و لە شاری سلێمانی لە حوجرەی خواجە ئەفەندی خوێندبووی. حوجرەی ناوبراو وەکو زانکۆ بووەو هەموو جۆرە دەرسێکی ئەو زەمانی تێدا گوتراوەتەوە. دایکم لە تەمەنی ٩٠ ساڵیدا دونیای بەجێ هێشتو کۆچی دوایی کرد.

باوکم لە هەموو شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی نەمردا بەشداری کردبوو. لە هەڤاڵەکانی تایبەتیی شێخینەمر بوو. من زۆرتر لەقسەکانی ئەو کە

دەربارەی کوردایەتیو شۆڕشەکانی شێخ مەحموود بۆی گێڕاومەوە، کەڵکم وەرگرتووەو هەر لە منالییەوە مێشکم بە باسەکانی کوردوکورستان کراوەتەوە. باوکم لە ساڵی ١٩٦٠ لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

باپیرەم حاجی رسوڵ ئاغا، زۆر پیاوێکی لێوەشاوەی زەمانی عەشایری بووەو زۆر قسەوباسی مێژوویی دەزانیو بەتایبەتی دەربارەی عەشیرەتی "میرئاودەلی" و پشدەر زۆرقسەی بۆ دەگێڕاومەوە. ماڵی ئێمە زۆر قەڵەباڵغی خێزانی تێدا هەبوو و هەمیشە لە ٢٥ تا ٣٠ کەس کەمتر لە ناو ماڵدا نەبوونو هەموشیان بەتەباییو لەباری دەژیان. باپیرم تا خۆی مابوو، دەستەڵاتدار بوو و نەیدەهێشت ناخۆشی بکەوێتە ناو خێزانو ئەوکاتە هیچ جۆرە ئاژاوەو دووبەرەکی نەدەکەوتە ناومالمان. ئێمە مەڕو ماڵێکی زۆرمان هەبوو. لە کاتی هاوین‌دا دەچوینە کوێستانەکانی "بازاڕ" لە ناوسنوری ئێرانداو ماوەی چوار تا پێنج مانگ بەناوی ئاژەڵبەخێوکردن لەژێر چادرىڕەش(رەشماڵ) دەماینەوە.هەتا بڵێی بیری ئەو رۆژە خۆشانە دەکەینەوەو بەتاسەوە ئاواتیان بۆ دەخوازین.

هەموو رۆژان سەر لەئێواران ئەو شۆڕەسوارانە کۆدەبونەوەو بەدەنگی دەهۆڵو زوڕناوە سوارەکان دەکەوتنە مەیدانداریو جلیتبازی. ئەو کاتە خەڵکی پشدەریش هەمووی بەتێکڕا دەهاتنە کۆێستانو لەو هەوارو هەوارگە خۆشانە کەپرو ڕەشماڵی خۆیان هەڵدەداو کەس بیری لە کارو کاسبی دەشتی پشدەرو بیتوێن نەدەکردەوە. تەنیا بە چەند سەر مەڕو بزن کە خوا پێیدابوو ڕازی بوو. لەو کووێستانانە ئاوی ساردی کەللەتەزێنی دەخواردەوەو شای ئێرانی بەسەپانی خۆی نەدەزانی. ئەو چەندساڵە خۆشانەی زەمانی گەنجیەتیمان ڕابواردو دوای ئەوە کەوتمە ناو دەریای گیروگرفتی ژیانو زۆر دەردی سەرىو ناخۆشیم بە سەرهاتن.

لە هەمووی ناخۆشتر ئەوەبوو کە ماڵی باوکمو مامم لە یەکتر جیابوونەوەو من ناچار بووم هەموو لێپرسراوەتی کارو کاسبیو ئیشو کاری ماڵو منال بخەمە سەر شانی خۆم. چونکە باوکم هەر لەمناڵیەوە بە ئاغایەتی

ژیابوو و هەرگیز خۆی فێری کارو کەسابەت نەکردبوو و خدرو حەسەن‌و مەحموودی براگچەشم منالّ بوون، دەبوایە هەر خۆم مشوورخۆری هەموو شت بم. سەرەرای ئەوەش بۆلەبۆلّو تورەیی باوکم لەویّ بوەستێت‌و نەیدەهێشت ئیشەکانمان بە رێکی‌و هێمنی برواتە رێوە. لەو کاتەدا، شەری دووەمی جیهانی هەلگیرسابوو. هەموو شتومەکو خواردمەنییەک زۆراگران بوو. شەکرو چا کەوتبووە قاتی‌و قری‌و زۆر کەس بە خورماو مێوژ چایان دەخواردەوە. گەنم‌و جۆ لە پشدەرو ناوچەکانی‌تری کوردستانیش دەس نەدەکەوت. خەلّک ناچاربوون بە کاروانی ئێسترو گوێ‌درێژ بچنە ناو خاکی ئێران‌و لە ناوچەکانی"سەقز"و "بۆکان" گەنم‌و جۆ بهێنن. وەزعی فەقیرو هەژار زۆرناخۆش بوو. زور کەس توشی نەخۆشیی جۆراوجۆری وەک "گرانەتا"، "سل" و کەم خوێنی بوون‌و بەبیّ دوکتورو دەرمان دەمردن. لە هەموو قەلادزیّ تەنیا نەخۆشخانەیەکی بچوکی بیّ‌دەواودەرمان هەبوو. ئێمە لەچاو خەلّکی‌تر زۆر باش‌بوین‌و تارادەیەک هەمووکەم‌و کورپەکانمان بە فرۆشتنی مەرو بزن چارەسەر دەکرد. ئەو کاتە مەرومالّات پارەی باشی دەکرد. ئەم گرانییە چوار سالّ درێژەی کێشاو لەئەنجامدا خوای گەورە بە هانای خەلّکی هەژارەوە هات‌و ئەو بەلّا ئاسمانیانەی وەک "سون" و "کوللە" و بیّ‌بارانی، هەمووی لە ناوچون‌و ژیان‌و گوزەرانی خەلّک هاتەوە بارودۆخی جاران.

**پشدەرو عەشیرەتی میرئاودەلی**

وەک پیشتر باسم کرد، دەمەویّ لە سەرەتای "یادداشتەکانمدا" هێندیّ باسی پشدەرو دروست‌بوونی عەشیرەتی میرئاودەلی بکەم‌و جۆری ژیان‌و ئیدارەیان بخەمە بەرچاری خوێنەری خۆشەویست‌و بەرەی داهاتوو. لێرەدا مەبەسم ئەوە نییە "هەرێمایەتی‌و نەژادگەری" بەکار بێنم، بەلّکو تەنیا دەمهەویّ دەوری بەرزی ئەو عەشیرەتە پیشانی خوێنەرانی خۆشەویستی تازەپێگەیشتوو بدەم، تاوەکو لە مێژووی پرلە ئازایەتی‌و دلّپاکی‌و جوامێری ئەو پیاوە کۆنانەی عەشیرەتی پشدەر کەلّک وەرگرن‌و تێبگەن ئەو پیاوانەی قەدیم چۆن بە

مەردایەتی ژیاون‌و هۆی چی بووە بێ‌ئەوەی رێگا بە دوژمنانیان بدەن‌و بەسەریاندا زاڵ بن، بە درێژایی یەک دوو سەدە زیاتر لەو مەڵبەندەدا بە ئازادی‌و سەربەستی ژیاون.

ئەوەیە عەشیرەی پشدەر؛ بەپێی ئەو ئاگادارییەی کە باپیرم حاجی رسوڵ ئاغا هەیبوو و چەند کەسانی‌تریش لە پیاوە کۆنەکان بۆیان باسکردووم، عەشیرەتی پشدەر بریتییە لە "نوورەدینی ومیرئاودەلی". عەشیرەتی نوورەدینی بە ناوی گوندێک لە پشدەر ناودەبرێن، ئەگینا هەموو گوندەکانی بناری پشدەر واتە لە هەڵشۆو بێگلاس هەتا دەگاتە هێرۆو بێتاسەو باوزەو گەناو و قەندۆڵ، هەمووی بە عەشیرەتی نوورەدینی دەژمێرێت. ئەم عەشیرەتە بە درێژایی مێژوو لەم ناوچەیە نیشتەجێ بوون. بەڵام عەشیرەتی "میرئاودەلی" وەکو ئێمە زانیومانە چەند کەسێک بوون‌و لە جزیرو بۆتانەوە "جزیرەی ئیبن عومەر" بەرەو ناوچەی هەولێر هاتوون‌و لەوێ دەستەیەکیان بە ناوی عەشیرەی "گەردی" لێ بەجێماوەو نیشەجێ بووە. ئەوانی‌تر هاتوونەتە ناوچەی پشدەرو بوونەتە دوو بەش. بەشێکیان بە ناوی عەشیرەتی "فەیزوڵلابەگی" چونەتە ناوسنووری ئێران‌و لە ناوچەی "بۆکان" نیشتەجێ بوونە. من خۆم زۆرکەسم لە ئاغاکانی "فەیزوڵلابەگی" دیتووە کە زۆر باش دان بەو راستییە دادەنێن. ئەو چەندکەسانەی کە لەناوچەی پشدەر ماونەتەوە، عەشیرەتی "نوورەدینی" خزمەتیان کردوون‌و رێزێکی زۆریان گرتوون. پیاوی هەرەکۆنی عشیرەتی میرئاودەلی ناوی "ئەبداڵ" یا "ئاودەل"ەو لە دوای ئەو "حەمەد ئاغا"ی گەورەیە کە دەبێتە باپێرە گەورەی هەموو ئاغاکانی میرئاودەلی. هەموو عەشیرەتی میرئاودەلی لە پشتی حەمەد ئاغان‌و هەموویان کوڕو کوڕەزای ئەون. بەپێی ئەو ئاگادارییانەی هەمانەو لە باپیرم (حاجی رەسوڵ‌ئاغا)و پیاوە کۆنەکانی لای خۆمان وەرمگرتووە، "ئاودەل ئاغا"ی دووەم لەچیای سنجار لە شەڕی نێوان داسنی "یەزیدی"و میری سۆران پاشای کۆرەی رەواندزدا کوژراوە. میری سۆران بە خۆی‌و لەشکری عەشایرەکانی ژێردەستەڵاتی چۆتە سەر یەزیدیەکان‌و تاروماری کردوون. کاتێ کە ئاودەل‌ئاغا کوژراوە، نوورەدینیەکان

حەمەدئاغای کوڕی ئاودەڵئاغایان لە جێگای باوکی کردۆتە براگەورەو سەرۆک. هەرچەند کە ئاودەڵئاغا کوڕێکی گەورەتریشی جگەلە حەمەدئاغا بە ناوی "هۆمەرئاغا" هەبوو، بەڵام ئەو وەکو حەمەدئاغا زیرەکو لێهاتوو نەبوو، هەر بۆیە حەمەد ئاغایان کردۆتە سەۆک. حەمەدئاغا ژنی زۆر هێناونو نیزیکەی ٢٠ تا ٢٥ ژنی هەر لە ناوچەی پشدەرو دەوروبەری هێناوە. لەوژنانە زۆر کچو کوڕی بوون، بەڵام هەر ناوی ١٦ تا١٧ کوڕی هەیە کە پاشەواریان لێکەوتۆتەوەو منالیان لێوەپاشکەوتووە. ئەم کوڕانەی حەمەدئاغا بەپێی بەرەدایک بەتایفە ناویان براوە. ئەگەر دووان سێیان لە دایکێک بووبن، بەناوی براگەورەی ئەم بەرەدایکە ناوی تایفەکەیان براوە. هەموو کوڕەکانی حەمەدئاغا بەپێی بەرەدایک لە خوارەوە کراونەتە حەوت تایفە، بەڵام حەز دەکەم باسی عەشیرەتێکیتر لەناوچەی پشدەردا بکەم، ئەویش عەشیرەتی "سەکر"ە.

## عەشیرەتی "سەکر" لە ناوچەی پشدەر

پێش ئەوەی ئاغایانی میرئاودەلی لە جەزیرەی ئیبن "عومەر" رابکەنو بگەنە ناوچەی پشدەر، جگە لە عەشیرەتی "نوورەدینی"، عەشیرەتێکیتریش بە ناوی عەشیرەتی "سەکر" هەبووە کە ئەوانە زۆر بە دەسەڵاتو جەربەزە بوونەو توانیویانە دەستەڵاتی خۆیان بە سەر عەشیرەتی نوورەدینیدا بسەپێننو بە هەموو شێوەیەک بیانچەوسێننەوە. ئەو عەشیرەتە هەر لە کۆنەوە لە گوندەکانی "بێشێر"، "گیرە"، "شلەمرە"، "دێگە"، "هورێوە"و "دارشمان" نیشتەجێ بوون. سەکرەکان زەویو زارێکی زۆریشیان لە کوێستانی "بازاڕ"و ناو خاکی ئێراندا هەبووە کە هەموو ساڵێک لە هاویندا بۆ هەواخۆریو مەڕو ماڵات لەوەڕاندن رۆیشتوونەتە ئەوێ. ئێستەش شوێنی سەرۆکەکانیان هەر دیارە کە بە "شجرەالبید" واتە بێیەکەی میری ناسراوە. ئەو درەختەی کە وا سێبەری خۆشە. ئێستەش دارە"بێ"یەکە هەرماوە. سەکرەکان لە زستاندا گەڕاونەتەوە سەر گوندەکانی خۆیان. زانیومانە ئەو ئاغا سەکرانە زۆر بە توندیو زۆرداری

لەگەڵ عەشیرەتی نووەدینی رەفتاریان کردووە. بۆ وێنە گۆیا هەرکاتێ بە میوانی رۆیشتوونەتە گوندێک، هەرگیز رازی نەبوونە گوێیان لە قرەی "بۆق" بێت‌و قرەقری بۆقیان زۆر پێ ناخۆش بووە، هەربۆیە خەڵکی گوندەکەیان ناچار کردووە ریخۆڵەی حەیوان فوو بدەن‌و بیخەنە سەر شێوەی "مار"و بۆ ترساندنی بۆقەکان لە ناو ئاوەکاندا فڕێی بدەن. وادیارە بۆق لە مار دەترسێت‌و ناوێرێ قرە بکات.

بە هەر حاڵ کاتێ ئاغایەکانی میرئاودەلی لە ناوچەکەدا جێگیر دەبن‌و عەشیرەتی نوورەدینی زۆرخزمەتیان دەکەن، هەموولایەک بڕیار دەدەن دەستی زوڵم‌و زۆرداریی عەشیرەتی "سەکر" کورت بکەنەوەو بەم هۆیە چەند شەڕو تێکهەڵچوون لە ناویاندا پەیدا دەبێت. لە ئەنجامدا عەشیرەتی سەکری دەستەڵاتدار لە جیژنی رەمەزاندا هێزێکی چەکداری زۆر لە بێشیر کۆدەکەنەوەو پێش ئەوەی نانی‌جێژن بخۆن، هێرش دەکەنە سەر عەشیرەتی ئاغایانی میرئاودەلی‌و نوورەدینیەکان کە بە نیازی بەرگری لە گوندی هێرۆ کۆببوونەوە. گۆیا سەکرەکان سوێندیان خواردووە هەتاکو "ئەو رەوە بەرازانە" لە ناو نەبەن‌و تاروماریان نەکەن، نابێ نانی جەژن بخۆن. ئیتر هەر لە "دۆڵی مرێ" خوار گوندی "هێرۆ" بۆتە شەڕێکی خوێناوی‌و چارنووس‌ساز. ئاغایانی میرئاودەلی‌و نوورەدینی سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیان وەدەست هێناوەو توانیویانە لەشکری سەکران بشکێنن‌و نانی ئامادەکراوی جەژنی سەکران لە گوندی "بێشر" بخۆن‌و بە یەکجارەکی دەربەدەریان بکەن‌و بەرەو ناوچەی باڵەکایەتی راویان بنێن‌و هەرچی دێهات‌و زەوی‌و زاری هەیانە، دەستی بەسەردا بگرن. ئێستەش ئەو عەشیرەتە لە باڵەکایەتی لە شوێنێک بە ناوی دۆڵی سەکران نیشتەجێن‌و چەند گوندێکیان هەیە.

پاش ئەوەی سەرکرەکان لە ناوچەی پشدەر دەرۆنە دەرەوە، هەرچی زەوی‌و زاری هەیانبووە، چ لە گەرمیان‌و چ لە کوێستانی بازاڕ، هەموویان لە مابەینی ئاغایەکانی میرئاودەلی‌و نوورەدینیەکاندا دابەش کراوە. ئێستاش جوتیارانی ئەو گوندانەی لە سەرەوە باسمان کردن، زەوی‌و زاریان لە ئاغاکانی

میرئاودەلی زیاتر هەیەو لە گوندەکانی وەک "گیرە"، "دارشمانە"و "هورێوە" ئاغاکان هیچ بەشیان نییەو جوتیارەکانی نوورەدینی لە کوێستانی بازاڕیش بەشی خۆیان بۆ دیاریکراوەو زەوەیەکان بە ناوەکانی خۆیانەوە وەک زەویەکیانی "باوازیا"، "چەکوانیان"، "هێرۆیان و هتد دیارن.

## تاییفەکان لە عەشیرەتی میرئاودەلی بە پێی ناوی براگەورەی هەر بەرەدایکێک

١- تایفەی بابەکرئاغا کە ناوبراو خۆی کوڕە گەورەی حەمەدئاغا بووە.

٢- تایفەی مەحموودئاغا کە مەحموود ئاغا لەگەڵ خدر ئاغا دایکیان یەکێکە.

٣- تایفەی رەسولئاغا کە رەسولئاغاو موسائاغاو قادرئاغا دایکیان یەکێکە.
تایفەی ئەحمەدئاغا کە ئەحمەدئاغاو برایمئاغا لە بەرەدایکێک بوون .

٤- تایفەی بەگزادە. مستەفاو حسێن ئاغاو عەزیز ئاغاو ئاودل ئاغا لە یەک دایک بوون.

(ئەو تایفەیە واتە بەگزادە، دایکیان زۆر ناشیرین بووە و حەمەد ئاغا بە گاڵتە پێی گوتووە بەگزادە.)

٥- تایفەی عەلیئاغا دوو برا بوون بە ناوەکانی عەلیئاغاو هەباسئاغا.

٦- تایفەی هەباس ئاغا تەنیا هەر هەباس ئاغا بووە.

تایفەیەکیتریش هەیە بە ناوی تایفەی هۆمەرئاغا کە ئەویش برا گەورەی حەمەد ئاغا بووەو ئەوانیش ئێستە تایفەیەکی زۆرنو خەڵکێکی زۆریان لێ وەپاش کەوتووە.

هەر تایفەیەک لەو تایفانە، لە سەت هەتا دووسەت کوڕو کوڕەزایان هەیە. ئەگەر توانیمان درەخت " شجرە" یەکی ریکوپێک لەو کوڕە زۆرانەی حەمەد ئاغاو پاشماوەکانیان دروست دەکەین. بەڵام ئێستە ژمارەی پاشەواریان ئەوەندە زۆر بووە کە خۆشم لەوانەی تازە پێگەیشتوون، بەشی زۆریان ناناسم.

## فراوان بوونی عەشیرەتی پشدەرو دامەزراندنی ئەنجومەنی "ماقوڵان"

عەشیرەتی میرئاودەلیو نوورەدینی لەگەڵ یەکتریدا زۆر بێ فەرقو جیاوازی بوونو هەر بەم یەکیەتیەش توانیویانە زۆربەی زۆری ئەو ناوچانانەی دەوروپشتی خۆیان وەکو مەنگورایەتیو جافەتیو شارباژێرو بەشێک لە خاکی ئێران وەک ناوچەکانی سویسنیو ڕەبەتی گەورەک بخەنە ژێر دەستەڵاتی خۆیانەوەو بە پشدەریان ببەستنەوە. وەک زانیومانە، خەڵکی شارباژێر خۆیان هاتوون بۆ پشدەرو داوای چەند ئاغایەکی میرئاودەلییان کردوە کەبچنە ناویانو ئیدارەی وڵاتیان بۆ بەڕیوەبەرن. ئەو ئاغا ناسراوانەی کە داوایان کردوون، یەکەم عەوڵای ڕسوڵئاغا بووە کە باوکی دایکم بووەو دووەمیان وەسمانئاغا کوڕی بابەکرئاغا بووە کە هەردوکیان نەوەی حەمەدئاغای گەورە بوونو هەروەها عەتائاغا کوڕی حەمەدئاغای گەورە، ئەمانە بەدرێژایی زەمان لەوێ ماونەتەوەو خەڵکیتریش ڕۆیشتونەتە لایانو نیشتەجێ بوونە. بەڵام دەربارەی ناوچەی مەنگورایەتی، عەشیرەتی ناوبراو زۆر دژی عەشیرەتی پشدەر وەستاونو هەمیشە بەربەرەکانیان لەگەڵدا کردونو ئەوانیش ناچار بوونە شەڕیان لەگەڵدا بکەنو لە ناوچەکە پاکیان بکەنەوەو بەرەو ئێرانیان ڕاوبنێن. ئەو کاتە عەشیرەتی مەنگوڕیش زۆر پیاوی ناوداری وەک هەمزەئاغاو بایزپاشایان هەبوون کە ئەمانە هەردوکیان خاوەنی پلەوپایە بوونەو چەکدارێکی زۆریان لەژێر دەستابووە. زۆر جار وا ڕێکەوتووە کە عەشیرەتی مەنگوڕ لە ئێرانەوە هێرشیان هێناوەتەوە سەر پشدەرییەکان. پاش چەند شەڕی خوێناوی دیسان شکستیان خواردوەو گەڕاونەتەوە ناو خاکی ئێران. لەو شەڕانەدا زۆر لە پیاوە ئازاو ناودارەکانی میرئاودەلیو نوورەدینی کوژراون کە ماوەی ئەوەمان نییە باسیان بکەین.

## ئەنجومەنی ماقوڵان

دەربارەی ئەنجومەنی "ماقوڵان" ئەوەی کە شایانی باسکردنە ئەوەیە کە عەشیرەتی میرئاودەلی خۆیان پێشنیاریان کردوەو ڕێگایان داوە بە نورەدینیەکان کە لە ناوخۆیاندا ئەنجومەنێکی ماقوڵان دابمەزرێنن‌و بە پێی هەڵبژاردنێکی ئازاد ئەندامەکانی ئەو ئەنجومەنە دەست نیشان بکەن. ئەمەش وا دەگەیێنێ کە یاسای دیموکراتیەت پێش ئەوەی لە وڵاتانی ڕۆژئاوا (ئەوروپا و ئەمریکا) باسی لێبکرێت، لە پشدەر پەیڕەوی لێکراوە. هەڵبژاردنی "ماقوڵ" واتە ئەندامی ئەو ئەنجومەنە بەو شێوەیە کراوە کە لە هەموو گوندەکانی بناری پشدەر بەبێ ئەوەی هیچ کەسێک لە ئاغاکان مافی دەست تێوەردان یا خۆپاڵاوتنیان لە هەڵبژاردنەکاندا هەبێت، دەستیان کردوە بەهەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ. ئەم ئەنجومەنە بۆ ماوەی سێ ساڵ لە کارەکانیدا بەدەوام بووەو دوای سێ ساڵ جارێکیتر هەڵبژاردن تازە کراوەتەوە. کۆبونەوەی ماقوڵان دائمی نەبووە، بەڵکو هەرجارە بەپێی پێویست زۆرتر لە مزگەوتەکان‌و هەرجارەش لە گوندێک کۆبوونەتەوە. هەریەک لەپیاوماقوڵەکان دەبویایە "پەستەک"ی سوور بکەنە بەرخۆیان بۆ ئەوەی هەموو کەس بزانێت کە ئەمە لە پیاوە ماقوڵەکانە واتە پەستەکی سوور لە جێگای ڕوتبەو نیشان بووەو دەبوایە سەرۆکی عەشیرەتیش ئەم پەستە سورە وەکو خەڵات بۆ هەریەک لە ماقوڵان بنێرێت. لەبەر ئەوەی کەوا ئەم هەموو گەڕان‌و سوارانەوە بە بێ وڵاغی سواری ئیمکانی نەبووە، دەبوایە پیاوماقوڵیش خۆی وڵاغی سواری بۆ خۆی پەیدا بکات.

بڕیارو قەراراتی ئەنجومەنی ماقوڵان نەدەبوایە هەڵبوەشێت‌و بڕیاری زۆر گرنگیشیان داون. بۆ وێنە جارێکیان بڕیاریان داوە کە تایفەی بەگزادە بەتێکڕایی لەناوچەی پشدەر دەربکرێن، چونکە ئەو تایفەیە زۆر دەستی خراپەو ئاژاوەنانەوەیان هەبووەو زۆر جارانیش بە بڕیارەکانی ئەنجومەنی ماقوڵان ڕازی نەبوونە. ئەمجا کە دەریان کردون، چونەتە ناوچەی ڕانیەو نیزیکەی دوو ساڵ لەوێ ماونەتەوە. لە ئەنجامدا لە سەر تکاو ڕەجای حاجی ڕەسول‌ئاغا

کوڕی مەحموود ئاغا بەو مەرجەی بۆ هەموو بڕیارەکانی ئەنجومەنی ماقوڵان سەرشۆڕبن، هێناویاننەتەوە پشدەر.

سەرۆکی گشتی عەشیرەتی پشدەریش لە ڕێی دەنگدانەوە لە لایەن ئەنجوومەنی ماقوڵانەوە هەڵدەبژێراوە. بەمجۆرە یەکێک لە ئاغایەکان بۆ ماوەی سێ ساڵ هەڵدەبژێردراوە. ئەگەر ئەم سەرۆکە نەیتوانیبایە وەک پێویست کارەکانی خۆی جێبەجێ بکات، ئەنجومەنی ماقوڵان بڕیاریان بۆ هەڵبژاردنی تازە دەداو یەکێکی‌تریان لە جێگای ئەو دادەنا. سەرۆکایەتی عەشیرەتی پشدەر هەمیشە بۆ ئاغاکان پارێزراو بووەو نوورەدینیەکان ئەو مافەیان نەداوە بە خۆیان کە سەرۆک لەخۆیان هەڵبژێرن. درئامەد واتە داهاتی سەرۆک لە کاتی سەرۆکایەتییەکدا زەکاتی هەموو گوندەکان بووە لە گەنمو جۆو هەروەها کۆکردنەوەی پیتاک "تەبەروعات"، بۆ ئەوەی سەرۆک بتوانێت بە شێوەیەکی جوان خەرجی بکاتو دیواخانەکەی هەمیشە بۆ میوانان گەرمو گوڕ بێت. ئیتر ئەم یاسایەی ئەنجومەنی ماقوڵان هەرچەندی بیری لێبکەیتەوە، ڕێکوپێک بووەو دەتوانین بڵێین کە هەر بەم یاسا جوانە توانیویانە یەکیەتیی ناوخۆیان بپارێزنو بەسەر دوژمنانی خۆیاندا زاڵ بن. من وەکو ئاگادارمو خۆم بە بیرم دێت، ئەم ئەنجومەنە هەتا ساڵەکانی ١٩٣٥ هەرمابوو و چەند جار هەر لە مزگەوتی گوندەکەی ئێمە (بێناسە) کۆبونەوەیان دەکردو باپیرم حاجی رسول ئاغا زۆر خزمەتی دەکردن. لە ناو ماقوڵەکاندا چەند پیاوی ناسراو و دیار هەبوون کە هەمیشە دەنگیان لەهەڵبژاردنەکاندا زۆر وەدەگرت، ئەمانە بوون:

١-مام برایم لە گوندی عیساوا

٢ - حسین بەررۆژ لە گوندی ئەشکەنە

٣ - کاکە مەم لە گوندی باوزە

٤ - ئەحمەدی مستەفا لە گوندی هێرۆ

٥- حاجی مالا حوسێن لە گوندی هەڵشۆ

٦ - فەقێ ئەحمەد ناسراو بە "کوولەکە ڕەق" لە گوندی بێناسە

٧- خاڵە هەباس لە گوندی گەناو

٨- حەجی رەسوڵ لە گوندی رەشتۆ
٩- کا رەسوڵ لە گوندی بیکڵۆ
١٠- قادری مام عەلیو خاڵەهەباس لە گوندی چەکوان

لێرەدا دەمەوێ باسی ئەم فەقێ ئەحمەد کولەکەرەق"ە بکەم کە جارێک شێخ رەزای تاڵەبانی رێی دەکەوێتە گوندی بێناسەو لە پێشەوە دەچێتە ماڵی فەقێ ئەحمەدو کاتێ بە سواری وڵاغەکەی دەگاتە بەدەرگای ماڵەکەیان دەبینێت کەوا ناوبراو وەکو پێویست پێشوازی لێناکات. ئەویش تورە دەبێتو دەڕوات. شەو دەچێتە گوندی "ئاوەکە" کە نیوکاتژمێر لە بێناسەوە

دوورە. هەر لەوێوە نامەیەک بۆ سەرۆکی عەشیرەتی پشدەر کە ئەو کاتە سەلیم ئاغا بووە، دەنوسێتو بەم شێوەی خوارەوە زەمی فەقێ ئەحمەد دەکات:

**ماقووڵی بەهی ناسە لەقەب کوولەکە رەق**
**وا لازمە هەرلێی دەیو هەر بیدەیە بەر شەق**
**چۆن ئەکرێ بە تۆ عەزڵو نەسب مامە کوولە (واتەکولوکە)**
**ناکەس بەچە، بێشەرمو حەیا، ماکەری ئەبڵەق**
**گەر تەبعی سەلیمت هەیەو ئاغا تۆ سەلیمی**
**هۆرێکی وەهای تێبرە کە هەر توندو نەبێ لەق**

ئەوەش هەر لەو کاتەدا دەبێ کەوا فەقێ ئەحمەد هەوڵ دەدات کارێکی وا بکات سەلیم ئاغا لە سەرۆکایەتی بکەوێتو یەکێکیتر لە جێگای ئەو دانرێت. بۆیە شێخ رەزا دەڵێ چۆن ئەکرێ بە تۆ عەزڵو نەسب.

ئەمجا کاتێ هەواڵی ئەم نووسراوەی شێخ رەزا بە ناو خەڵکدا بڵاو دەبێتەوە، فەقێ ئەحمەد ناچار دەبێت بە دوای شێخ رەزادا بڕواتو لە قەڵادزێ پێی دەگاتو داوای لێبوردنی لێ دەکاتو سوێندی بۆ دەخوات کە نەیناسیوە. ئەویش لێی دەبوورێت. ئیتر با بگەرێینەوە سەر باسی پیاوماقوڵان. ئەم ئەنجومەنە وەکو باسمان کرد، هەتا ساڵەکانی ١٩٣٥ هەر مابوو، بەڵام دوای ئەوە، وەزعی پشدەر بە تێکرایی کەوتە شلوخیو نارێکیو ئەو یەکیەتیو خۆشەویستیەی کە لە ناو خەڵکدا هەبوو، دەستی بە کزبوون کردو جیاوازیو

دوبەرەکی جێگای یەکەتیو برایەتی گرتەوە.  لە ئەنجامدا وای لێهات کە ئەنجومەنی ماقوڵان لە کارکەوتو لە چلەکاندا دەوری تەواوبوو. ئەمەش وەک راستییەک ناشاردرێتەوە کە بۆچی ئەو ئەنجومەنە تێکچو.

بابەکری سەلیم ئاغا کە لە لایەن ئینگلیزەکانەوە سزای پێدرابوو، سەرۆکایەتی پشدەری بۆ خۆی کردبوو بە میرات. لە بەرامبەری ئەویشدا هەباسی مەحموود ئاغا بەیارمەتیو پشتیوانی چەند تایفەی میرئاودەلی خۆی کردبوو بە سەرۆکو هەردوکیان کەوتبوونە بەربەرەکانی یەکترو هەمیشە بە مەبەستی شەخسیی خۆیان لە ناو خەڵکدا تۆوی دووبەرەکیان دەچاندو لەلایەکیتریشەوە هەردوکیان بەیەکەوە هەوڵیاندەدا ئەنجومەنی ماقوڵان لە کار بکەوێتو خۆیان ببن بە دەستەڵاتدارو هەمەکارەی ناوچەی پشدەر. ئەم دوو کەسانە بە پارەو یارمەتی حکومەتی عێراق توانیان  هەموو تایفەکانیتر بکەنە پشتیوانی خۆیانو سەرکردایەتی پشدەر بۆ خۆیان بچەسپێنن. بەم کردەوە نایاساییو خۆپەرستیەی کە بەکاریان هێنا، ئەو کردەوانەی خوارەوەیان لە بەرامبەر خەڵکی ناوچەکەدا ئەنجام دا:

١- بناغەی یەکیەتیو رێکیەتی لە نێوان هەموو خزمو خزمایەتیدا هەڵوەشاو خزمو لایەنگیر پەیداکردنیان کەوتە سەر پارە بەخشینەوە.  بە جۆرێک هەموو مەعاشەکانی  خۆیان کە لە حکومەتی عێراقیان وەردەگرت، دەبویایە مانگانە  بە سەر حزمو لاینگرەکانیاندا دابەشی بکەن.

٢- کارو کەسابەت لە ناو خزمانی میرئاودەلدا نەماو هەموو ئیشوکاریان بوو بە سواربوونو دابەزین لە دیوەخانەکان بۆ کۆبونەی بێجێو رابواردن بە غەیبەتی یەکتر.

٣- خزمو کەسوکاریان فێری "مفتەخۆری" کردن، بێ ئەوەی بیر لە دووا رۆژ بکەنەوەو بزانن کە هەر خزمێکو دۆستێک کە بە پارە و پووڵ  بگیرێت  جێگای متمانە نیەو بۆ کەس نابێتە ماڵ.

٤- ڕێگا بە تەواوی  بۆ مرۆڤی نەزان و زۆردار کرایەوە کە دەستدرێژی بۆ سەر فەقیرو هەژاران بکاتو بەکەیفی خۆی بۆ پڕ کردنی گیرفان چەپو گوپ بکات.

بەم شێوەیە وەزعی پشدەر ڕۆژ بە ڕۆژ هەر بەرەو تێکچوونو ئاڵۆزی ڕویشتو دەستەڵاتی پشدەرو دەسەڵاتی ئاغاکانی میرئاودەلی لە زۆربەی ناوچەکانی وەکو جافەتیو شاراژێرو شوێنەکانیتر کەوتە کزیو لاوازی. بەڵام لە ناوخۆی پشدەرا هەیکەلی عەشایری هەر ماو تاڕادەیەک سامو ترسی ئەو عەشایرە ناودارە لەسەردڵی خەڵکی بێگانە لانەچوبوو. هەتا ساڵەکانی مابەینی ١٩٥٥هەتا ١٩٦٥ کە بە یەکجاری کۆتایی بە سامو دەستەڵاتیان هات کە لە داهاتودا باسی لێدەکەین.

لێرەدا دەمەوێ ئەم ڕاستییەش نەشارمەوە کە ئەم دوو سەرۆکانە هەرچەند کە بۆ سوودی تایبەتی خۆیان ئەنجومەنی ماقوڵانیان تێکداو ئەو یاسا جوانو ڕێکوپێکەیان خستە ژێرپێو خەڵکیان فێری بەرهەڵڵاییو لاساری کرد، بەڵام لە لایەکیتریشەوە زۆر سیفاتی گەورەییو مەردایەتییان تێداهەبوو کە دەکرێ بەم جۆرەی خوارەوە باسیان بکەین:

١- هەرکات بیانزانیبایە مەترسییەکی گەورە  لە لایەن بێگانەوە بۆ سەر ناوچەی پشدەر هەیە، یەکسەر دەڕۆیشتنە ماڵی یەکترو هەموو کێشەو ناخۆشی خۆیان دەخستە لاوە و بە یەکەوە  بەرامبەر ئەو مەترسیەی کە دەکەوتە سەر ناوچەی پشدەر شانبەشان دەوەستان.

٢- هەردوکیان جیا بە جیا ئامادەبوون کە دەستی خەڵکو لێقەومان بگرنو بە پارەو ئیمکانیەتی خۆیان یارمەتییان بدەن.

٣- ئەو پیاوە سەربزێوە دەستوەشینانەی کە لە دژی حکومەتەکانی عێراقو ئێران یا تورکیا هەڵدەستانو پەنایان بۆ پشدەر دەهێناو خۆیان دەخستە بن باڵی یەکێک لەو دوو سەرۆکانە، بەوپەڕی ڕێزەوە وەردەگیرانو جێگاو ڕێگایان بۆ دابین دەکرا.

٤ - ئەو دووسەرۆکە  یەک لە یەک بەخشندەتر بوون‌و دیوانخانەکانیان هەمیشە بەبێ جیاوازی بۆ هەموو میوانێکی ناسراو و نەناسراو ئوتێل بەلاش بوون.

لێرەدا دەمەوێ هێندێ روداوی گرنگ‌و پڕ لە شانازی ئەو عەشیرەتە باس بکەم‌و بیخەمە یادداشتەکانمەوە. ئەویش بریتیە لەو شەڕە گەورەو خوێناویانەی کە کاتی خۆی لەگەڵ حکومەتە داگیرکەرانی دەورووپشتی خۆیان کردوویانە. منیش لە زوبانی ئەم پیاوە کۆنانە بەتایبەتی باوکم‌و باپیرم بیستووە کە  خۆیان لەگەڵ شەڕەکاندا بوون‌و لێرەدا بەبێ زیادەوکەم دەینووسمەوە.

وەک بیستوومانە عەشیرەتی پشدەر هەر لە کۆنەوە بوون‌و سەربەستی خۆیان پاراستووەو ماوەیان نەداوە کە حکومەتەکانی دەوراوپشتیان بە هیچ جۆرێ دەست بخەنە ناویان‌و ئازادی‌و سەربەخۆییان لێ تێک بدەن. زۆر جاران وا رێکەوتووە کە یەکێک لەم حکومەتانە شاڵاوی بۆیان هێناوە، بەڵام خوای گەورە بە هانای ئەم عەشیرەتەوە هاتووەو هەموو جارێک توانیویانە  بەسەر دوژمنەکانیاندا زاڵ بن‌و هەرگیز ماوەیان نەداوە کە وڵاتەکەیان لە لایەن داگیرکەرانەوە پێشێل بکرێت. ئیتر لەم رێگایەوە زۆر فیداکارانە جەنگاون‌و خوێنیان رشتووەو بە سەدان پیاوی ناودارو قارەمانیان لێ شەهید کراوەو ئەمە کورتەی هەریەک لەو شەڕانەیە کە کردوویانە:

### شەڕی تورک عوسمانلی

لە  مابەینی ١٨٧٥ تا ١٨٨٥ واتە لە مەودای ئەم ١٠ ساڵەدا،  حکومەتی تورکیا دەستدرێژی کردۆتە سەر عەشیرەتی پشدەرو لە دوای چەند جار شەڕو لێکدان حکومەتی تورک بەسەر پشدەری‌یەکاندا زاڵ بووەو توانیویەتی شاری قەڵادزێ داگیر بکات‌و فەرماندەیەکی سوپا بەناوی "حوسنی بەگ"بە خۆی‌و فیرقەیەک سەرباز لە قەڵادزێ نیشتەجێ بکات‌و لە ئەنجامدا عەشیرەتی پشدەریش ناچار دەبن کە بە خۆیان‌و ماڵ‌و خێزانیانەوە بکەونە بناری پشدەر لە نیزیکی سنووری ئێران. لەوێ بڕیار دەدەن دوو کەسی فیدایی بۆ کوشتنی

"حوسنی بەگ" بنێرن‌و ئەم دوو قارەمانە کە هەردوکیان لە عەشیرەتی نورەدینی بوون، بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە گرنگە ئامادەیی خۆیان پیشان دەدەن. یەکەمیان "حەسەنە خڕە" کە لە دواییدا حەجی کردووە و بە حاجی حەسەنەخڕە ناسراوە و دووەمیشیان ناوی "حەسەنە کوێر" بووە. ئەم دوو کەسە دەکەونە ناو هەموو لەشکری سوارەی پشدەری‌یەکان‌و دوو ئەسپی زۆر چالاکو نەبەز هەڵدەبژێرن‌و بە جووتەسوارە بە ناوی ئەوەی کە نووسراوی تایبەتی‌یان لە لایەن سەرۆک عەشیرەتەکانی پشدر بۆ حوسنی‌بەگ هێناوە، لە قەڵادزێ دەچنە ناو سوپای حوسنی بەگ. کاتێ دەگەنە بەر دەرگای بارەگای فەرماندەی ناوبراو، دەبینن کە خۆی لەگەڵ ئەفسەرو کاربەدەستانی لەبەر دەرگای "بارەگا" وەستاوە. ئەوانیش هەر یەکسەر بە سواری ئەسپەکانیانەوە تەقە لە حوسنی بەگ دەکەن‌و دەیکوژن‌و بە ناو ئەم هەموو سوپایەدا خۆیان رزگار دەکەن. هەرچەند سوارەی نیزامی دەکەونە دوایان، بەڵام پێیان ناگەن‌و بە ساغو سلامەتی خۆیان دەگەیەننەوە لای سەرۆکەکانیان‌و ئەوانیش زۆر رێزیان لێ‌دەگرن‌و تەنانەت ئەو رێز و تەقدیرە بۆ پاشماوەکانیشیان بە میرات هەر مایەوە. چونکە ئەو کاتە ئەگەر یەکێک کارێکی گرنگی مەردانەی ئەنجام دابایە، هەگیز فەرامۆش نەدەکرا. دوای ئەو رووداوە زۆری پێ‌ناچێت کە سوپایەکی گەورە بە ناوی تۆڵەی حوسنی بەگو فەوتاندنی عەشیرەتی پشدەر لە ئەستەمبوڵەوە دێت. کاتێ سوپای تورک دەگاتە قەڵادزێ لەگەڵ عەشیرەتی مەنگوڕی عیراقو ئێران پەیوەندی دەکات، بۆ ئەوەی ئەوانیش وەکو دوژمن بێنە خوارەوە لە لای رۆژهەڵاتەوە پشت لە عەشیرەتی پشدەر بستێنن‌و بە هەردوولایان گەمارۆی تەواویان بدەن‌و بیانخەنە ناو ئەڵقەی ئابلوقەوە. ئەوە بوو کە لە هەردوولاوە هێرشیان هێنایە سەر پشدەری‌یەکان‌و چەند رۆژو شەو ئەم شەڕە لە چیایەکانی گردەبێناس‌و چڕی "بەکاو" و "باپیرکوژ"و ئەم ناوە دەوامی کرد. لەم شەڕانەدا لەشکری پشدەر زۆر بە مەردانە بەرامبەر بە سوپای نیزامی تورک وەستان. لەشکری مەنگوڕ بە سەرۆکایەتی "بایز ئاغا"- ئەو کاتە بایز پاشا سەرزکی عەشیرەتی مەنگوڕی عیراق بووەو لە گوندی

"دێرێ" نیشتەجێ بووە. دەڵێن "حەمەدی کاوەتمان" پەیوەندی لەگەڵ عەشیرەتی نوورەدینی کردووە بۆ ئەوەی خۆیان لە ئاغایەکان جیا بکەنەوە تاکو بە هەموو لایەک بتوانن ئەم ئاغایانەی میرئاودەلی ناوچەی پشدەر پاک بکەنەوە. بەڵام نورەدینیەکان گوێیان بە قسەی حەمەدی کاوەتمان نەداوەو نەیانویستووە خۆیان لە ئاغایەکان جیاواز بکەنەوە. لە ئەنجامدا عەشیرەتی پشدەر ناچار دەبن کە هەموو ناوچەی پشدەر بەجێبهێڵن‌و بەماڵو خێزانەوە بچنە ناوچەی "ئالان" لە خاکی ئێران. لەو کاتەدا باشترین هەل دێتە دەست عەشیرەتی مەنگوڕ کە تۆڵەی خۆیان لە پشدەریەکان بکەنەوەو هەرچی دێهاتی پشدەر هەیە بە تێکڕایی دەسوتێنن بۆ ئەوەی جارێکیتر نەتوانن بگەڕێنەوە سەر جێگاو شوێنی خۆیان. وەکو لە باپیری خۆم بیستووە کە ئەو خۆی بەشداری ئەو شەڕانە بووە، دەیگوت ئەگەر لەشکری مەنگوڕ لە ئێرانەوە نەهاتبایە خوارو بۆ یارمەتیدانی تورک پیشتی لێ نەگرتباین، ئێمە سەرکەوتوو دەبووین‌و هەموو سوپای تورکیمان لەو چیاو چۆڵانەی هێرۆ و بێتاسە لەناو دەبردو دەیگوت چەند سوارێکی پشدەری بە سەرکردایەتی مامەندئاغاو عەولای رەسوڵئاغاو حەسەنەخڕە توانیان لە زینوێ گردەبێتاس پێش لە عەسکەری تورک بگرن‌و بە سەدان سەربازی تورک لەم شوێنەدا بکوژن‌و ئێستاش ئەم شوێنە بە "قەبرەنیزام" ناسراوەو لە سێوەڵە نیزیکی گوندەکەی ئێمەیەو شوێنی قەبرەکانیان هەر ماوە. ئەوە بوو پشدەرییەکان کاتێ کە گەیشتنە ناوچەی ئالان" لەوێوە دوو پیاوی وریاو زیرەکیان ناردە لای شای ئێران (موزەفەرالدین شای قاجار) کە ئەو کاتە پایتەختی ئێران شاری "تەورێز" بووە. تاکو شای ئێران بە رەسمی وەرییان بگرێت‌و پەنایان بدات. ئەو دوو نوێنەرانە یەکەمیان عەولای رەسوڵئاغاو دووەمیان وەسمان ئاغای کوڕی بابەکرئاغا بووە کە هەردوکیان نەوەی حەمەد ئاغای گەورە بوون. ئەوانە بە سواری دوڵاغ رۆیشوون‌و چوون و هاتنەوەیان دوو مانگی کێشاوەو لەوێ فەرمانی شایان وەرگرتووەو گەڕاونەتەوەو ماوەی دوو ساڵ لە خاکی ئێران دامەزراون. ئینجا حکومەتی تورک وای بە باش زانیوە کە هەرچۆنێک بێت، ئەم عەشیرەتە

بگەڕێتەوە سەر جێگاورێگای خۆیو چیتر لە خاکی ئێران نەمێنێتەوە. لە ئەنجامدا بەخشینی گشتی "عەفوی عام" لە لایەن حکومەتی تورکیاوە دەردەچێتو ئەوانیش بە دانانی چەند مەرجێک دەگەڕێنەوە ناوچەی پشدەر و گوندەکانی خۆیان ئاوەدان دەکەنەوەو کۆتایی بە شەڕو ناخۆشی مابەینی پشدەریو تورک دێت.

لەم شەڕانەدا زۆر پیاوی ناودار شەهید کراونو زۆر زیانی ماڵیش بەر خەڵکی پشدەر کەوتووە، بەڵام ئەو شەڕە وەکو دەڵێن بۆ حکومەتی تورکانو دوژمنانیتری پشدەر دەرسێکی گەورە بووە. کوژرانی حوسنی بەگ دەنگێکی گەورەی داوەتەوەو ئێستەش قەبرەکەی بەرامبەر بە قەڵادزێ لەسەر گردێکە کە بە "گردی حوسنی" ناسراوە.

بە نیسبەتی مەنگوڕەکانیش ئەوە بوو کە پشدەرییەکان دوای ئەم شەڕە کەوتنە گیانیانو بە یەکجاری هەموو گوندەکانیان لێ داگیر کردن.

## شەڕ لەگەڵ روسیای قەیسەری

لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا کاتێ روسیا لە ساڵی ١٩١٦ هاتە کوردستانی ئێرانو لەوێشەوە بەو نیازەی کە خاکی عیراق بە هاوکاری لەگەڵ ئینگلیز داگیر بکەنو هێزەکانی تورکیاش لەناو بەرن، بەرەو سنووری عیراق کەوتەرێ. سوپای روسیا بەو نیازە لە سێ خەتەوە بەرەو عیراق هات.

یەکەم خەت، رێگای شنۆو خانێو حاجیئۆمەران. دووەم خەت، سەردەشت، پشدەرو سێیەم خەت، سەقز بانە پێنجوێن شارەزوور. عەشیرەتی پشدەر پێش ئەوەی کە سوپای روس بگاتە ناوچەکانی کوردستان، بەرەو پیری شەڕ چوونو هەر لە "خۆی"و "سەڵماس" لە نیزیک سنووری مابەینی ئێرانو روس پێشیان پێگرتو لەوێوە بە شەڕو کشانەوە هاتن هەتاکو گەیشتنەوە ناوچەکانی مەهابادو بۆکانو لەوێ تووشی شەڕێکی بێئەمانی زۆر خوێناوی بوون. بە رادەیەک کە شاڵاو و هێرشەکانی دوژمن بەرەوژووری توانای لەشکری پشدەر بووەو لەو شەڕەدا خەڵکێکی زۆر شەهید کراون کە چەند

قارەمان لە پشدەریەکان لە ناو ئەو شەهیدانە دابون. یەکەمیان "حاجی سەید گوڵ" باوکی شێخ حوسێنی بۆسکێن، دووەم تۆفیق بەگ ناسراو بە "تابورر ئاغاسی" باوکی ئەحمەد بەگ، سێیەم ساڵح بابەکری سەلیم ئاغا، چوارەم حاجی "حەسەنە خڕە" ئەو حاجی حەسەنەی کە لەگەڵ حەسەنە کوێر حوسنی بەگی کوشت. ئەم شەهیدانە هەموویان لە گوندی "ئاچیت"ی نیزیکی "بۆکان" نێژراون‌و ئێستە زیارەتگەی خەڵکی ئەو ناوچانەی کوردستانی ئێرانن. باوکم حاجی ئەحمەد ئاغا کە خۆی بەشداری ئەم شەڕانە بووە، بۆی باسکردم‌و دەیگوت ئێمە لەشکری پشدەر زۆر هیلاکو ماندوو بووین‌و سەرماو برسییەتی یەکی خستبووین، چونکە خەڵکی دێهاتەکان هەمووی لە ترسی سوپای روس کە وەکو گورگی هار پەلاماری خەڵکیان دەدا و لەناویان دەبردن، رایان کردبوو. گوتی ئێمە ناچار بووین بەرەو سنووری عیراق تا ناوچەی سەردەشت بکشێینەوەو لەوێ بەرەی تازەمان دروست کردو لەشکری پشدەریش ئەوەی لە عیراق مابوو، بە تێکڕای سوارەو پیادە گەیشتە لامان‌و چونکە شەڕی مان‌ونەمان بوو، سەرۆکەکانی پشدەر خۆشیان هاتن. لەوێ شەڕ گەرم دەبێت‌و پاش چەند رۆژ شەڕو لێکدان لە دەوراوپشتی شاری سەردەشت، دەتوانن سوپای روس بشکێنن‌و هەتا دەشتی رەبەت بە دوایدا برۆن‌و لەو شەڕانەی دەوروپشتی سەردەشت جگە لە برینداری زۆر، زۆر مرۆڤی ناودار شەهید کران، لەوانە شەهیدی ناودار بابەکر حەمەدئاغا، ئامۆزای باوکم.

لەو شەڕانەدا دیسان زۆر پیاوی ناودار شەهید کراون‌و ئێستەش لە پشتی سەردەشت چیایەک هەیەو چونکە زۆر لە ئاغایەکانی پشدەر لەم گردەدا شەهید کراون، بە گردی ئاغایان ناسراوە. بە هەر حاڵ بەمجۆرە فیداکارییە ماوەیان نەداوە سوپای روس بگاتە سەر سنووری عێراق. بەڵام لە خەتی حاجی ئۆمەرانەوە سوپای روس توانی بە ئاسانی بگاتە رەواندزو سوپای تورکەکان لە سەر رێگای خۆی تارومار بکات. سوپای روس ماوەی دوو مانگ لەو شارە مایەوە و هەشتا لەسەدی خەڵکی ئەو شارەی لەناو برد. خۆم لە پیاوە کۆنەکانی ئەو ناوچەیەم بیستووە کە دەیانگوت زۆر لە ژنانی ئەو شارە چونکە

دیتوویانە سەربازەکانی روس وەکو درندە لە گەڵ خەڵکی کوردستاندا جووڵاونەوە، لە ترسی "فەساد" کردنیان خۆیان خستۆتە ناو گەڵی خەرەندو مردون. ئەوەندە بەسەر ئەو رووداوەدا تێناپەڕێت کە شۆڕشی ئۆکتۆبر لە روسیا هەڵدەگیرسێتو رژێمی قەیسەری لە ساڵی١٩١٧ لە ناو دەچێت. سوپای روس لە هەموو بەرەکان دەکشێتەوەو هەموو ناوچەکانی کوردستان بەجێ دەهێڵن.

لەو شەڕانەی کە عەشیرەتی پشدەر لە گەڵ سوپای روسیا کردوویەتی، چەند نوێنەری تورک بە ناوی ئیدارەو دابەشکردنی چەکو تەقەمەنی لەگەڵ پشدەریەکاندا بەشداریان کردووە، بۆیە حکومەتی تورکیا خۆی دانی بەوەدا هێناوە کە پشدەر شوورەیەکی پۆڵایینەو هیچکەس ناتوانێت ئەو شوورەیە بشکێنێتو لە دوای ئەمە تورکیا زۆر رێزی لە عەشیرەتی پشدەرناوەو چەکو فیشەکێکی زۆری بۆ ناردون. تفەنگی تەیارەشکێنی ئەڵمانی کە تازە پەیداببوون، وەجبەیکی زۆریان وەکو دیاری بۆ رەوان کردون. ئەمەی راستی بێت، ئەو شەڕانەی کە لەگەڵ روسیا کراون، هەموو بە مەبەستی بەرگریکردن لە ئاینی ئیسلامیەتەوە بووە. دەیانگێرایەوە کە مەلایەکانی ئایینی خۆیان زۆر دەوریان لە هاندانی خەڵک بۆ جیهاد کردن هەبووەو قسەیەکی زۆر خۆشمان دەربارەی مەلایەک لەو مەلایانەی کە بۆ شەڕ رۆیشتونەتە بەرە دێتەبیر و ناوی مەلا مەحموود بووە. گوتیان ئەم مەلایە هەمیشە قسەی بۆ خەڵک دەکردو پێی دەگوتن ئەگەر ئێوە پشتی خۆتان بکەنە دوژمنی کافر، خۆشتان کافر دەبنو تەڵاقیشتان دەکەوێت. ئینجا رۆژێ بە رێکەوت هێرشی دوژمن دەکەوێتە ئەو بەرەیە کە مەلا مەحموود لێی دامەزراوە و مەلا تەنگاو دەبێتو هاوار دەکاتو بە دەنگی بەرز دەڵێ خوایە ئەم جارەشم شەهید مەفەرموو ئەم قسەی مەلا مەحموود لە ناو خەڵکدا ببوو بە نوکتە.

## شەڕی پشدەر لەگەڵ ئینگلیز

کاتێ حکومەتی بەریتانیا لە ساڵی ١٩١٤ هاتە ناوخاکی عیراق‌و بە ناوی "ئینتداب" هەموو شوێنەکانی عێراقی داگیرکرد، سوپایەکی گەورەشی هێنا ناوچەکانی رانیەو پشدەرو لەخوار دەربەند لە مابەینی قەڵادزێ‌و رانیە ئوردووگای دانا. بابەکری سەلیم ئاغایان کردە حوکمداری گشتی ئەم ناوچەیەو لە لایەن ئینگلیزەکانەوە زۆر ریزی لێ دەگیراو موچەی تایبەتی خۆی شەو و روژ ٢٤ لیرە بووە. ژمارەی ٧٠٠ سواریش لە خزم‌و کەسوکاری خۆی بۆ کراوەتە موچەخۆرو هەریەکەیان ٨٠٠ رۆپیەی وەرگرتووە. دەستەڵاتی بابەکر ئاغا لەم ناوچەیەدا یەکجار زۆر بووەو هەرچی داوای کردبایە ئینگلیزدکان بۆیان دەکرد. بەڵام بەداخەوە ناوبراو هیچ بیری لە سیاسەت‌و بەرژەوەندی گشتی نەکردۆتەوە و تەنیا هەر خەریکی کۆکردنەوەی پارەو پوڵ بۆ گیرفانی خۆی بووە. ئەگینا ئەگەر هێندێ بە بیروباوەڕی کوردایەتی‌و نیشتمانپەروەرییەوە تێکۆشابایە، دەیتوانی نەک هەر لە خزم‌و کەسەکانی خۆی لە پشدەر کەڵک وەربگرێت، بەڵکو دەیتوانی زۆر کەسی‌تریش لە رۆشنبیرو خوێنگەرمی بۆ کوردستان لە دەوری خۆی کۆبکاتەوەو بە ئاسانی ئینگلیزەکان بۆ پێکهێنانی ئەمارەتێکی کوردی لە ناوچەکانی کوردستاندا رازی بکات. چونکە وەکو دەگێرنەوە ئەو کاتە بارودۆخی سیاسی زۆر باش رێکەوتووەو ئینگلیزەکان حەزیان کردوە کە یەکێکی دڵسوزی وەکو بابەکر ئاغا کە سەر بەخۆیان بووە، بەرامبەر بە شێخ مەحموود راست بکەنەوە. ئینگلیزەکان ئەوەی ئامادەبوون بیدەنە شێخ مەحموود، دەیاندا بابەکر ئاغا. چونکە بەراستی شێخ مەحموود لە گەڵ ئینگلیزەکان نەگونجاوەو هەمیشە دژی ئەوان کاری کردوە. بە هەر حاڵ، بابەکر ئاغا نەیتوانی ناوچەکەی خۆشی واتە ناوچەی پشدەریش بەڕێوەبباتو بەلای کەمیەوە پێی نەکراوە خزمەکانی میرئاودەلیش لە خۆی رازی بکات. ئەوە بوو کۆمەڵێکی زۆر لە خزمانی پشدەر لە دژی بابەکر ئاغا، هەباسی مەحموود ئاغایان کردە سەرۆکی خۆیان‌و بڕیاریان‌دا بە مەبەستی تێکچونی وەزعەکە لە بابەکر ئاغا، لە بەرامبەر

ئنگلیزەکاندا شەڕ بکەن. بۆ ئەو مەبەستەش ویستیان پێشەکی یارمەتی دەورو پشتیوان بۆ خۆیان پەیدا بکەن، بۆ ئەوەی هیچ نەبێت چکو فیشەکیان بداتی. بەو مەبەستە پەیوەندییان لەگەڵ حکومەتی تورکیا کرد. تا ئەو کاتەش حکومەتی تورکیا لە قەزای رەواندزدا هێزی سوپای مابوو. ئیر نوێنەرێکی خۆیان بە ناوی ئەحمەدی حەمە ئاغای بێشیر ناردە لای "ئۆزدەمیر" فەماندەی سوپای ئەو وڵاتە لە رەواندز. ناوبراو زمانی تورکی باش زانیوەو قسەی لەگەڵ ئوزدەمیر کردوەو ئەویش ئامادەیی خۆی بۆ هەموو جۆرە یارمەتییەک پێشانداوە. بەڵام ئەو کاتە توانایی ئەوانیش لە رەواندز ئەوەندە نەبووە کە پشتیوانی تەواویان لێبکەن‌و تەنیا چەند رەشاشێکو ١٠ تا١٢ سندوق فیشەکیان پێداون. ئەوە بوو لە هاوینی ساڵی ٩٢٢ دا هەباس ئاغا بە خۆیو خزمانی پشدەرەیو چەند کەسێکیش لە ناوچەی "ئێزە"و "گێوژە" بە سەرۆکایەتی غەفوورخان کە ئەوانیش بۆ یارمەتیدانی هەباس ئاغا هاتبوون، هێرشیان بردە سەر سوپای ئینگلیزو لە پاش شەڕێکی خوێناویی مان‌و نەمان توانیان ئەو سوپا گەورەیەی ئینگلیز بشکێنن‌و بە خەساراتی زۆری ماڵیو گیانیەوە هەتا دەیگەیەننە شاری کۆیەو راوی بنێن. بۆ بەیانی ئەو راستییەش "ئەندموندس" ئەفسەری سیاسی ئینگلیزی کە ئەو کاتە خۆی لەناو ئەم سوپایەدا ئیشی کردوە، لە کتێبە یادداشتەکانی خۆیدا کە لە لایەن جەرجیس فەتوڵلاوە وەرگێردراوەتە سەر زمانی عەەبی، باسی ئەو شەڕەی دەربەندی پشدەری بە درێژی کردوەو دان بە شکان‌و هەڵاتنی خۆیان دادەنێت. لەوشەڕەدا کۆمەڵێکی زۆر لە ئاغایانی میرئاودەلی وەک بابەکری قارئاغا کە دەکاتە مامی باوکمو مەحموودی بابەکر ئاغا برازای هەباس ئاغا شەهید کراون. جگە لە بریندارانی زۆر لەو شەڕەداو دوای ئەوە هەباس ئاغا بەخۆیو خزمانیەوە بۆ سەر سنووری ئێران کشایەوە. پاش ئەوەی سوپای ئینگلیز ئەم ناوچانەی بەجێهێشت، دەستی کرد بە بۆمبارانی ئەو گوندانە کە سەر بە هەباس‌ئاغاو خزمەکانی ئەو بوون. فرۆکەکانیان شەو و رۆژ بەسەر ناوچەکەدا دەەسوڕانەوەو تەڕو پووشیان بەیەکەوە دەسوتاند. ئینگلیزەکان بێزاری خۆیان

زۆر لە بابەکر ئاغا پێشاندا کە بێلایەن دانیشتو نەیتوانی پارێزگاری لەسوپای ئینگلیز بکات. هەر بەتۆڵەی ئەوەش خستیانە پشتگوێو حوکومداریەکەیان لێ سەندوە. زۆریشی پێ نەچوو ئینگلیزەکان پێوەدیان بە هەباس ئاغاوە کردو لە ناوچەی پشدەر دایانمەزراندەوە. مەبەستیان ئەوەبوو کە زەرەرو زیان هەرنەبێ لە نێوە بگەڕێتەوەو لەم ناوچانەدا زیاتر تووشی شکستی سیاسی نەبن. مەرجەکانی هەباس ئاغاش لەگەڵ ئینگلز بۆ ڕێککەوتنەوەو دامەزرانەوە شتێکی زۆر سووکو ئاسان بوون. یەکەمیان بژاردنەوەی زەرەرو زیانی بۆمبارانو دووەمیان فەرقو جیاوازی نەکردن لە مابەینی ئەو و بابەکر ئاغاداو موچەی مانگانەیان وەکو یەک بۆ سەرف بکرێت. مەرکەزیەتی هەباس ئاغا لای ئینگلیزەکان زۆر بەرز بووەو بەپێچەوانە پلەی بابەکر ئاغا هاتە خوار. بەڵام لەگەڵ ئەوەشا ئینگلیزیکان زیاتر متمانەیان هەر لە سەر بابەکر ئاغا هەبووەو هەباس ئاغایان بۆ خۆیان بەماڵ نەدەزانی.

## شەڕ لەگەڵ حکومەتی ئێران

وەک پێشترێ باسمان کرد ئاغایانی پشدەرو عەشیرەتی نوورەدینی زەویو زاریان لە ناو خاکی ئێراندا هەبوو و هێندێ لەئاغاکانی خاوەندەسەڵات گەیشتبونەتە ناوچەی رەبەتو سوێسنیو لەوێدا زۆر دێهاتیان داگیر کردبوو و هێدێکیشیان بەپارە کڕیبوو. باوکیشم گوندێکی بە ناوی "هەنداوە" لە ناوچەی رەبەت هەبوو. کاتێک رەزا شای پەهلەوی لە ئێران هاتە سەر حوکم، ویستی ئاغایەکانی میرئاودەلی لە ئێران دەربکاتو ئەو زەویو زارەیان بکاتە ئەمیری. بۆ ئەو مەبەستە بە بیانووی وتووێژ لەگەڵ نوێنەری "شا" بۆ سەردەشت بانگهێشتیان کردن. هەموویان لە کۆشکی سەرای میری کۆکردنەوەو دوای هێندێ قسەکردن، بۆ چەندمانگێک هەمویان خستنە بەندیخانەوە کە لەوانە یەکێکیان باوکم بوو. ئەو بۆی گێرامەوەو گوتی لە بەندیخانە هەموومان بە یەکەوە بووینو پاش ماوەیەک ئەوانەی پارەمان هەبوو، توانیمان بە پارەو بەرتیل خۆمان رزگار بکەینو ئەوانەی پارەشیان

نەبوو، نزیکی ساڵێک لە ناو بەندیخانەدا مانەوەو لە ئەنجامدا ئاغایانی پشدەری بەتێکڕایی پارەیان بۆ کۆکردنەوەو هەموویان بە "بەرتیل" ئازاد کردن. حکومەتی ئێران هەموو ماڵی ئاغاکانی لە خاکی ئێران کردە دەرەوەوەو زەوی‌و زارەکانیشیانی لێداگیرکردن. پشدەرییەکان ناچار بوون بۆ پارێزگاری لە مافی خۆیان لەشکر کۆبکەنەوەو بەرامبەر بە سوپای ئێران بوەستن. لە ساڵی ١٩٢٧ دا لەشکری پشدەر لە سەر سنووری مابەینی عیراق‌و ئێران هێرشێکی بەرفرەوانی کردە سەر سوپای ئێران‌و توانیان لە یەکەم شاڵاودا سوپای ئێران بشکێن‌و لە سنووری عراق‌و ئێران دووری بخەنەوە. بەوەش وازیان لێنەهێناو هەتا گەیاندیانەوە ناو ئۆردوگای سەردەشت، بەدوایدا رویشتن‌و لەوێ بۆ ماوەی ٤٥ رۆژ ئابڵوقەی ئۆدوگایاندا. حکومەتی ئێران ناچاربوو بۆ رزگار کردنی ئەو سوپایەی کە لە سەردەشت ئابلوقە درابوو، بە هۆی کۆنسۆلی خۆیەوە لە سولێمانی پەیوەندی لە گەڵ شێخ مەحموودی نەمر بکات. حکومەتی ئێران دەیزانی شێخ مەحموود زۆر دۆستی پشدەرییەکانەو لە قسەی دەرناچن. پاش ئەوە شێخ مەحموود چەند نوێنەرێکی تایبەتی خۆی بە نووسراوێکەوە ناردە لای بابەکر ئاغاو هەباس ئاغا. سەرۆکی وەفدەکەی شێخ مەحموود بۆلای پشدەریەکان سەید "ئەحمەدی مرخەس"ی ئامۆزای شێخ مەحموود بووەو لە نووسراوەکەی شێخ مەمحموودا داوا لە بابەکر ئاغاو هەباس ئاغا کراوە کە رێگا بۆ سوپای ئێران چۆڵ بکەن کە لەناوچەی سەردەشت بڕواتە دەرەوەو ئەو ناوچەیە چۆڵ بکات. پشدەرییەکانیش حەزیان نەکرد دڵی شێخ مەحموودیان لێ بهێشێت‌و قسەی بشکێنن، ماوەیان‌دا سوپایەکە بڕواتە دەرەوەو بەرەو مەهاباد رەوانکرا. ئەم سوپایە ئەگەرشێخ مەحموود فریایان نەکەوتبایە، ناچار بوو خۆی بە دەستەوە بدات. چونکە وەکو باسیان دەکرد هیچ ئازوقەیان نەمابوو و ناچار ببوون کە گۆشتی ئەسپ‌و ئێسترەکانیان بخۆن. من خۆشم لە فەرماندەی ئەو سوپایە عەقید" علی ئەسغەر " ناسراو بە پزشکیان کە لە ساڵی ١٩٤٠ بە فەرماندەی سوپای ئەو سنوورە تەعین کرابوو، بیستوومە، دەیگوت ئێمە چەند ئەفسەرو سەربازمان لێ کوژران‌و چەند رۆژ بە

گۆشتی ولاغەکانمان دەژیاین. گوتی من بە روتبەی رائدی توانیم لێپرسراویەتی ئەو هێزە سوپاییە وەربگرمو خۆم بە دەستەوە نەدەم. ناوبراو کاتێ کە هاتەوە سەردەشت ساڵی ١٩٤٠ روتبەی "عەمید" بوو و ژنێکیشی لە کوردەکانی سەردەشت هێناوە. دەیگوت کورد لە هەموو فارسو تورکو نەتەوەکانیتر زیاتر خاوەنی شەرەفو مەردایەتییە، بۆیە ژنی کوردم هێناوە. ناوبراو تا ئەم ساڵانە هەرمابوو، لە تارانیش بەخانەنشینی چاوم پێی کەوت، زۆر پیرو پەککەوتە ببوو.

ئینجا پاش ئەوەی سوپای ئێران بەوپەڕی شکستو سەرشۆڕییەوە ناوچەی سەردەشتی بەجێهێشت، عەشیرەتی پشدەر وەکو جاران دەستەڵاتی خۆیان وەرگرتەوەو گەڕانەوە سەر زەویو زاری خۆیان. ئیتر کاتێ حکومەتی "رەزاشا" بۆی دەرکەوت کە شەڕکردن لەگەڵ پشدەرییەکان جگە لە زیانی زۆرو شکستی بەرهەمێکیتری نییەو ناتوانێت لەو ناوچەیە دوریان بخاتەوە، ناچاربوو لە رێگای وتووێژەوە هەوڵ بدات چارەسەری ئەو کێشەیە بکات. ئەوەبوو یاریدەرێکی تایبەتی خۆی بە ناوی "سەرتیپ سەیفی ئەفشار" ناردە لای پشدەرییەکانو لە کوێستانی باژاڕ چەند رۆژ وتووێژیان کرد. لە ئەنجامدا پشدەرییەکان رازی بوون لە جیاتی ئەو دێهاتو زەویوزارەی کە لە خاکی ئێراندا هەیانبوو، مەبلەغێکی زۆر پارەیان بدرێتێ. بە مەرجێ ئەو پارانەی کە پێیان دەدرێت هەمووی "لیرەی زێڕ" بێت، نەک "زێو"و ئەسکەناس. بەهەرحاڵ پێکهاتنو پارەیەکی یەکجار زۆر کە چەند بەرامبەری گوندو زەویوزاری ئەوان بوو، وەریان گرتو لە ناو خۆیاندا دابەشیان کرد. ئەم کێشەیە لەگەڵ ئێران کۆتایی پێهاتو بناغەیەکی دۆستایەتیو تێکەڵاویان لەگەڵ حکومەتی ئێران دامەزراندەوە. رەزاشا خۆی فەرمانی بە لێپرسراوانی سنووردا کە رێگا لە ماڵە ئاغاکانی پشدەر نەگرن کە لە هاویناندا بە خۆیانو مەڕو ئاژەڵیانەوە بڕۆنە ناو خاکی ئێرانەوە. ماوەشی پێدان کە زەویوزارەکانی سەرسنوور کە پێیدەڵێن "باژاڕ" وەکو جاران دابچێننو بەرهەمیان لێوەربگرن. ئەم

پەیوەندی‌یە دۆستایەتی‌یەی مابەینی پشدەری‌یەکان‌و حکومەتی ئێران هەتا ساڵەکانی ١٩٦٣ هەر مابوو.

## هەڵوێستی عەشیرەتی پشدەر لە بزوتنەوەکانی کۆنی نەتەوایەتیدا

پیاوە ناودارەکانی عەشیرەتی پشدەر نەک‌هەموویان بەتێکڕایی، بەڵام زۆربەی زۆریان نیشتمان‌پەروەرو ئازادیخواز بوون‌و هەمیشە ئامادەیی خۆیان بۆ هاوکاری‌و پشتیوانی‌کردن لە بزوتنەوەکانی نەتەوەی کورد چ لە کوردستانی عێراق‌و چ لە کوردستانی ئێراندا پێشان داوە. بۆ وێنە چەند هەڵوێستێکیان دەخەمە بەرچاوی خوێنەری خۆشەویست.

١- لە ساڵی ١٩١٦ هەتا دەگاتە ساڵی ١٩٣٠ سمایل ئاغای شکاک، هەتا ئەو ساڵەی کە بە دەستی چەپەڵی ڕژێمی ئێران شەهید کرا، هەمیشە پەیوندی لەگەڵ عەشیرەتی پشدەردا هەبووەو لە سەرەتای دەست‌پێکردنی شەڕی سمکۆ لەگەڵ حکومەتی ئێران، عەشیرەتی پشدەر نوێنەرانی خۆیان بە سەرۆکایەتی "پیرۆتەخوار" کە یەکێک لە پیاوە ناسراوەکانی نوورەدینی بوو، ناردەلای سمایل ئاغا لە گوندی "چاریە" لە ناوچەی سەڵماس‌و پشتیوانی‌و هاوکاری خۆیان پێشان‌داو بەڵێنیان پێدا ئامادەن بە چەکدارو پارە دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکەن. دوای ئەوەش سمایل ئاغا خۆی بۆ ناو ئاغایانی پشدەر هاتە خوارو نیزیکەی یەک مانگ میوانیان بوو، لەوێشەوە ڕۆیشتە سولەیمانی لای شێخ مەحموودو چەند ئاغای پشدەریش لەگەڵیاندا ڕۆیشتن. نیازی سمایل ئاغا لەم سەفەرەدا ئەوەبوو یەکیەتی‌و ڕێکیەتیەکی بیروڕاو کارکردن لە ناو گەلی کورد بە تایبەت لە مابەینی خۆی‌و شێخ مەحمووددا پێکبهێنێت‌و کارێکیش بکەن کە هەر چۆنی بێت حکومەتی بەریتانیا متمانەیان پێ بکات‌و لە ڕێگای ئینگلیزەوە مافی کورد لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا مسۆگەر بکرێت. بەڵام وەک من لە باوکم بیستوومە کە خۆی لەو گەشتەدا بەشدار بووە، سمایل ئاغا زۆر لە هەڵوێستی شێخ مەحموود ڕازی نەبووەو هەرچەندە کە شێخ پێشوازی زۆر گەرمی لێ‌کردبوو، بەڵام سمایل ئاغا لای ئاغاکانی پشدەری گوتبووی شێخ

مەحموود بە کەڵکی رابەرایەتی گەلی کورد نایەتو خاوەنی رای خۆی نییەو نازانێ چی دەکات.

٢- هەڵوێستی عەشیرەتی پشدەر دەربارەی شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی نەمر ئەوە بووە کەوا زۆربەی زۆری ئاغایانی پشدەر هەر لە سەرەتای هەستانی شێخ مەحموودەوە پشتیان گرتووەو لە هەموو شۆڕشەکاندا وەکو چەکداری فیدایی لەگەڵیا بەشدار بوونو چەند کەسیشیان لێ شەهیدو بریندار بوونە. خۆم دێتە بیرم لە ساڵەکانی ١٩٢٨ یا ١٩٢٩دا شێخ مەحموود خۆی هاتە پشدەرو داوای چەکداری لە خزمانی میرئاودەلی کردو لە چەند ماڵی ئاغایەکان میوانداری لێکرا. خەڵکێکی زۆر لەگەڵ شێخ مەحموود کۆ ببۆوە، بە ماڵێکو دووماڵ میوانداری نەدەکرا، ماوەی چوار رۆژ لە دەشتی "بەکاو" مابەینی هیرۆو بێناسە مایەوەو لە لایەن ماڵێ هەباس ئاغاو حاجی رەسوڵ ئاغاو ماڵی ئێمەوە میوانداری لێکرا. داوای شێخ مەحموود ئەوەبوو کە هەموو لەشکری پشدەر بە تێکرایی لەگەڵیا بچێت. بابەکر ئاغا لە ترسی ناڕازیبوونی ئینگلیزەکان نەچووە ژێر باری ئەم داوایە، بەڵام هەباس ئاغا ئامادەیی خۆی پیشاندداو زۆربەی زۆری خزمانی چەکداری خۆیان کۆکردەوەو لەگەڵ شێخ مەحمووددا رۆیشتنو هەتا رۆژی کۆتاییهاتنی شۆڕش لەگەڵیا مانەوە. لەوانە یەکێکیان باوکی من بوو کە لە پێشتریشا هەر لەگەڵیا بوو.

- هەڵوێستی عەشیرەتی پشدەر دەربارەی "کۆماری مەهاباد". پێش ئەوەی قازی محەممەد ئاڵای کوردستان بەرز بکاتەوە، هەباسی مەحموود ئاغا کەوتە پەیوەندیکردن لەگەڵ قازی محەممەدو بۆی دەرخست کە ئامادەیە هەموو جۆرە هاوکاری لەگەڵدا بکاتو هەروەها مەحموودئاغای هێرۆش برازای هەباسئاغا زۆر دەوری مەردانەی هەبوو. لە کاتی شەڕەکانی نێوان کۆماری مەهابادو حکومەتی ئێران لە ناوچەی سەردەشت، ژمارەیەک چەکداری خۆی نارده بەرەی سەردەشتو خستیە ژێر دەستی "زیرۆی هەرکی" فەرماندەی ئەو بەرەیە. خەرجو سەرفیاتی ئەو چەکدارانەش هەر لە خواردەمەنیو چەکو فیشەکەوە هەمووی لەسەر شانی مەحموود ئاغا بوو. من خۆم لەم بارەیەوە

ئاگادارم. لە داهاتووشدا کاتێ کە گەیشتینە سەر باسی مەهاباد، زیاتر باسی لێ دەکەین.

جگە لەو دەورانەش کە باسمان کردن، عەشیرەتی پشدەر زۆر بە هانای خەڵکو لێقەوماوانەوە هاتوون. هەمیشە ناوچەی پشدەر بۆ داماوانو دەربەدەران بە تایبەتی بۆ ئەو کەسانەی کە لە ترسی رژێمەکانی دەوروپشتی کوردستان رایاندەکردو پەنایان بۆ پشدەر دەهێنا ،"قەڵاتێک" بووە. من چەند کەسێکم بەبیرا دێن کە هەریەک بە هۆیەکەوە رایانکردبوو و پەنایان بۆ عەشیرەتی پشدەر هێنابوو. چەند ساڵ مانەوە هەتاکو ئیشەکەیان بۆ جێبەجێ کراو گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان. بۆ وێنە لە ساڵانی نێوان ١٩٣٢و ١٩٣٥دا چەند کەسێک لەو راکردووانە کە لە حکومەتی عیراق قاچاخ بوونو پەنایان بۆ پشدەر هێنابوو، چەند ساڵ مانەوە. هەباس‌ئاغا هەوڵی بۆ دانو لە لایەن حکومەتی عیراقەوە فەرمانی بەخشینی بۆ وەرگرتن. ئەوانە بۆ ئەوەی حکومەتی عیراق زیاتر بایەخیان پێبدات، داواشیان لە هەباس ئاغا کرد کە چەند ئاغایەکی خزمی خۆی وەک رێزو ئیحترام لەگەڵیاندا بنێرێت بۆ چوارتا یا سلێمانی. ئەوانە بریتی بوون لە شێخ محەممەدە بچکۆڵە ئامۆزای شێخ مەحموود، حەمەعەلی روستەم، مەجید شانەشینی، مچە قرگەیی واتە مستەفا قرگەیو چەند کەسێکی‌تریش کە ناویانم لەبیرچۆتەوە. ئەمجا هەباس‌ئاغا مەحموودی کوڕی خۆیو چەند ئاغای‌تریشی لەگەڵ ناردن. منیش هەرچەند منداڵ بووم، لەم سەفەرەدا بەشداریم کرد. ئێمە هەمووومان بە سواری وڵاغ رۆیشتینو لە رێگای شارباژێرەوە چووینە "چوارتا"و بریار وابوو کە بچینە سلێمانی. بەڵام پارێزگار (ساڵح زەگی بەگ) لەوێ نەبوو. قایمقامی چوارتای بە ناوی "سەدیق بەگ" بە وەکیلی خۆی بۆ وەرگرتنو جێبەجێ کردنی ئیشی راکردووەکان دانابوو. شێخ لەتیف خۆی بۆ پێشوازی ئێمە هاتبوو بۆ "کەنارو"و لەلایەن قایمقامو خەڵکی ناوچەکەش زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنیان لێکراو ئەمەش وەکو رێزگرتنێک بوو لە عەشیرەتی پشدەر سەبارەت بە دامەزراندنەوەی ئەوانەی باسمان کردن.

دیسان هەر لەبیرمە کە "عەلی مەحموودی کاکەخان" دزەیی لە هەولێر دژی حکومەتی عیراق ڕایکردو نەیتوانی لە هیچ جێگایەک بحەوێتەوەو ناچار پەنای بۆ پشدەر هێنا. ناوبراو بە خۆیو چەند سوارێکەوە ماوەی سێ چوار مانگ زیاتر لە پشدەر مایەوە. لە پاشان کارێکی وا کرا کەحکومەتی عیراق لێیببورێتو بگەڕێتەوە سەر جێگاو شوێنی خۆی. هەروەها لە ساڵی ١٩٤٦دا عەبدوڵلای بایز ئاغا سەرۆکی عەشیرەتی مەنگوڕو مام عەزیزی قەرەنی ئاغای مامەش بە خۆیانو چل تا پەنجا سوار لە ئێران هەڵاتنو پەنایان بۆ پشدەر هێنا. ناوبراوان هەرچەندە کە لە دژی کۆماری مەهاباد رایانکردبوو، زۆر شایانی بەخێرهێنان نەبوون. بەڵام دابونەریتی کوردەواریو عەشایری سەیری ئەوە ناکاتو دەبێ هەر کەسێک پەنای بۆ هێنای ئەگەر دوژمنیش بێت، چی لە توانادا بێت درێغی بۆ نەکەیو ڕێزی لێبگرێت. ئەوانەش ماوەی سێ چوار مانگ لە پشدەر میوانی ئاغایەکان بوونو لە دوای ڕوخانی کۆماری کوردستان لە مەهاباد، گەڕانەوە بۆ ئێرانو دووکەس لە ئاغایانی پشدەریشیان تا مەهاباد لەگەڵا ناردن. ئیتر خەڵکیتریش لەم بابەتە زۆر هەیە کە هاتوونو پەنایان بۆ پشدەر هێناوە کە لێرەدا نە باسکردنیان پێویستەو نە ماوەش ئەوەندە هەیە کە یەکە یەکە هەموویان بنووسم.

### عەشیرەتی پشدەرو ڕژێمی شایەتی عێراق

هەر لەو ڕۆژەوە کە حکومەتی عیراق بە هێزی ئینگلیزەوە دامەزرا تاکو ساڵی ١٩٣٧ هیچ جۆرە تەشکیلاتێکی ئیداری لە ناوچەی پشدەر دانەمەزراو حکومەتی عیراق نەیدەویست بە ناوی فەرمانڕەواییەوە ڕوو بکاتە پشدەر، چونکە دەیزانی ئەم عەشیرەتە وا بە ئاسانی ناچێتە ژێر باری هیچ دەستەڵاتێک کە لە خۆی گەورەتربێتو هەرگیز ڕازی نینە ئەو ئازادیو سەربەخۆییەی کە ساڵەهای ساڵە بە خوێن پاراستویانە، لێیان تێک بدرێت. ئەوەبوو حکومەتی عیراق تەنیا بۆ ڕازیکردنی عەشیرەتی پشدەر هەموو مانگ مەعاشی تایبەتی بۆ سەرۆکەکان "بابەکرئاغاو هەباسئاغا" سەرف دەکردو داوای هیچ خدمەتێکیشی

لێنەدەکردن. ئەگەر جارێک وا رێکەوتبایە یەکێک لە کاربەدەستانی بەرزی میری هاتبایە بۆ ناوچەکانی کوردستان، ئەوا هەباس‌ئاغاو بابەکرئاغا بانگێشتن دەکران‌و ئەوانیش جیابەجیاو یا پێکەوە بۆ پێشوازی ئەم کاربەدەستەی میری دەڕۆیشتن‌و لەمە زیاتر هیچ جۆرە داوایەکی‌تریان لە سەر نەبوو. مانەوەی پشدەر بەم‌شێوە سەربەخۆییە ببوو بەجێگای پرسیارو سەرسوڕمانی خەڵکو زۆر جار قوتابیەکانی قوتابخانە لە بەغداو موصل‌و شارەکانی‌تر پرسیاریان لە مامۆستاکانی خۆیان دەکردو دەیانگوت ئایا پشدەر عیراقە؟ ئەگەر بەشێکە لە خاکی عیراق، بۆچی تەشکیلاتی ئیداری تێدا نەکراوەتەو بۆچی خەڵکی ئەو ناوچەیە خزمەتی ئاڵای عیراق ناکەن؟ ئیتر دەبێ وەرامی مامۆستاکانیش چی بێت جگە لەوەی کە بڵێن ئەمە پەیوەندی بە سیاسەتی میرییەوە هەیەو ئێمە هیچی لێ نازانین. لە زۆر لە ناوچەکانی‌تری کوردستانیش ئەو گلەیی‌و گازندەیە لە سەر حکومەتی عیراق هەبوو کە بۆچی ئەم فەرق‌و جیاوازییە هەیە. ئەمە لەسەر دڵی کاربەدەستانی رژێم پاشایەتی ببوو بە گرێیەکی گەورە.

## تەشکیلاتی بەڕێوە بەرایەتی لە پشدەر

لە ساڵی ١٩٣٧و لە کاتێدا کە "جەمیل مەدفەعی" کرا بە سەرۆک‌وەزیرانی عیراق، کاربەدەستانی رژێم لە بەغدا بڕیاریان‌دا کە بە هەرنرخێک دەبێ تەشکیلاتی بەڕێوەبەرایەتی لە پشدەر دابمەزرێنێ‌و ئەو "تەلیسمە" بشکێنرێت. سوپایەکی زۆریان بەرەو پشدەر ناردو ئەو سوپایە لە کۆتایی مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٣٧دا گەیشتە سەر زێ "زاب" لە گوندی میرزا رۆستەم. ئەو کاتە بەربەندی "دووکان" دروست نەکرابوو. بەو نیازە کە لە "زێ" بپەڕنەوە بۆ ناوچەی مەرگەو لەوێوە بۆ پشدەر، ئوردوگایان لە گوندی میرزا رۆستەم دروست کرد. عەشیرەتی پشدەریش هەرچی زووتر لەشکری خۆیان کۆکردەوەو بڕیاری شەڕی مان‌ونەمانیان داو داواشیان لە حکومەتی ئێران کرد بە ناوی پەیوەندی‌و دۆستایەتیەوە بە چەکو فیشەک یارمەتیان بدات. بەڵام

حکومەتی ئێران لەبەر هێندی ئیعتباراتی دەولیو هەروەها بەسترانی هەردوو ڕژیم بە سیاسەتی ئیستعماریەوە، نەیتوانی لەم کێشەیەدا خۆی بکاتە تەرەفو یارمەتی پشدەریەکان بدات. پشدەریەکان ناچاربوون تەنیا ئیعتماد لەسەر خۆیان بکەنو هەموو چەکداری خۆیان هێنایە چیای "ئاسۆس"و لە پشتی بنگردەوە هەتا دەگاتە دەربەند دامەزان. کاتێ ڕژێمی عێراق بۆی دەرکەوت ئەم عەشیرەتە ئامادەی فیداکاریەو بەئاسانی ناچێتە ژێر بارو شەڕکردن لە گەڵیان زۆر بە گران دەوەستێتو سەرکەوتنیش مسۆگەر نیە، ناچاربوو لە ڕێگای ئاشتییەوە چارەسەری کێشەکە بکات. بۆ گەیشتن بەم مەبەستە، لەئەنجومەنی وەزیرانەوە بە مەبەستی وتووێژ لە بەغدا، داوای نوێنەرانی پشدەر کرا. بابەکرئاغاو هەباسئاغا بۆ ناردنی نوێنەرانی خۆیان بۆ بەغدا، مانعیان نەبوو. حاجی مەلای حاجیئاغا کە برازای بابەکرئاغا بوو، لەگەڵ مەحموودی حاجیئاغا برازای هەباسئاغا، بە نوێنەریی گشتی ناردرانە بەغدا. لەپاش چەند دانیشتنو وتووێژ لە گەڵ کاربەدەستانی بەرزی میری لەسەر ئەو مەرجانەی خوارەوە پێکهاتتن:

١- قایمقامو موچەخۆرانی بەڕێوەبەرایەتی پشدەر هەموویان کوردبن.

٢-بەڕێوەبەرانی هەردو ناحیەکانی پشدەرو مەرگەو سەرۆکی شارەوانی قەلادزە لە ئاغایەکانی پشدەر دابنرێن.

٣- هەتا ماوەی ٧ ساڵ حکومەت داوای سەربازگرتن لە ناوچەکە نەکات.

٤- زەویو زاری پشدەر نەکەوێتە بەر یاسای "تەسوییەوەو مەساح"و حکومەت هیچ دەستدرێژییەک لە کێشەی زەویو زار نەکات.

هەموولایەک بەم مەرجانەی سەرەوە ڕازی بوونو بڵاوە بە لەشکری عەشایەری کرا. لەم هەموو سوپایەی عێراقیش کە لە ئوردوگای میرزا روستەمدا هەبوو، تەنیا یەک فەوج لەگەڵ مووچەخۆرانی بەڕێوەبەرایەتی هات بۆ پشدەر. هەمزەبەگ ناسراو بە هەمزەی شاسوار، کرا بە قایمقامی قەڵادزێو باپیری کوری بابەکرئاغاش بە بەڕێوەبەری ناحیەی پشدەر دانراو خدری حاجیئاغای برای مەحموودئاغاش کرا بە بەێوەبەری ناحیەی مەرگەو ئەحمەدی

بابەکری مامەندئاغاش بوو بە سەرۆکی شارەوانی قەڵادزێ. ئەمانە هیچ کامیان خوێندەواری وایان نەبوو کەوا ئیشوکاری دەوایری رەسمی بەڕێوە بەرن، هەر بە ناو دانران‌و کاتبەکانیان هەموو ئیشەکانیان بۆ بەڕێوە دەبردن.

ئەو فەوجە سەربازیەی کە هێنابویان بۆپشدەر، پاش یەک دوو مانگ کە زانیان هێمنی‌و ئاسایش لە پشدەر هەیە، ئەویشیان کشاندەوە. تەنیا چەند پۆلیسێکی کورد لەگەڵ دەستەی بەڕێوەبەرایەتی بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە دەستەڵات‌و ئەرکێکیان لەسەر خەڵکی ناوچەکە هەبێت، مانەوە. هەرچەند هەمزەبەگ یەکەم جار ویستی وەکو دەستەڵاتێک خۆی گیف بکاتەوەو دەست بداتە ئیشوکارو بەرگری لە خەڵک بکات کە لەناو شاری قەڵادزێ چەک هەڵبگرن، بەڵام دەستەڵاتی لە ژووری دایرەکەی خۆی زیاتر نەدەڕویشت‌و بۆی نەچووە سەر. حکومەت چونکە تێگەیشت ناوبراو لە گەڵ بارودۆخی پشدەر ناگونجێت، هەرخۆی گوازتیەوەو لەو ناوچەیە " نەقڵ" کرا. ئیتر وەزعی پشدەر هەتا ساڵەکانی ١٩٥٠ بەو شێوەیە مایەوەو حکومەتی عیراق لە قازانج زیاتر هیچ جۆرە قورساییەکی لەسەر پشدەر نەبوو. بەڵام دووای ئەوەی کە هەباس‌ئاغا کۆچی دووایی کردو مەحموودی حاجی‌ئاغا لە جێگای ئەو بوو بەسەرۆک، بابەکرئاغا کەوتە بەربەرەکانی مەحموود ئاغاو ئەویش بەامبەری وەستاو هەردوولا لە دژی یەکتر دەستیان کرد بە بانگاشەی خراپ‌و شکایەت‌و شکایەتکاری خۆیان گەیاندە کاربەدەستانی بەرزی میری. ئەمەش هەنگاوێک بوو بۆ بێ‌بەختی عەشیرەتی پشدەر، ئەگینا هەردوکیان زۆر مرۆڤی هۆشمەندو زیرەک‌بوون‌و دەیانزانی کە ئەمە کارێکی زۆر خراپەو ئەم دووبەرەکی‌و دوژمنانەیەتییە دەبێتە هۆی زاڵبوونی دەستەڵاتی میری بەسەریاندا. ئەم کارەش زیاتر سوچی بابەکر ئاغا بوو. مەحموودئاغا چونکە لە هەموو رویەکەوە بابەکرئاغای لە خۆی بە گەورەتر دەزانی، یەکەم جار نەیویست بەرامبەر بە دەستەڵات‌و کەسیەتی بابەکر ئاغا تەجاوەز بکات، بەڵام بابەکرئاغا ئەو رێزەی کە لە هەباس‌ئاغای دەگرت، لە مەحموود ئاغای نەدەگرت‌و بە

هاوشانی خۆی نەدەزانی. بەم دووبەرەکییە وەزعی پشدەر هاتە شڵەژان‌و بۆ دروستبوونی ئەو شتانەی خوارەوە ڕێگا خۆش‌کرا:

١- کاربەدەستانی میری ڕێگایان بۆ کرایەوە کە دەست بخەنە ناو ئیش‌و کاری پشدەرو تۆوی دووبەرەکیەکە زیاتر گەشە پێبدەن.

٢- بەرهەڵدایی خزم‌و عەشایرو پەیدابوونی گیروگرفت لە ئەنجامی ئەو نارێکیە، تۆوی دووبەرەکیەکە زیاتر گەشەی پێدراو شیرازەی کارەکان تێکچوو.

٣- هاتووچۆی خزمان لە مابەینی هەردوکیاندا وای‌لێ‌هات هەرلایەک زیاتر خزمەتی کردبان‌و پارەی پێدابان، زیاتر خزم لە دەوری کۆ دەبوونەوە.

٤ - خەڵک فێری درۆو دووڕوویی‌و فێڵ‌و تەڵەکەبازی بوو و بەم شێوەیە وەزعی پشدەر کەوتە قۆناغێکی نارێک‌و پڕمەترسی‌یەوە کە لە داهاتوودا زیاتر باسی دەکەین.

## ڕۆیشتنم بۆ ناو کۆماری کوردستان لە مەهاباد

لە ساڵی ١٩٤٥دا کەوتمە ناو کوردایەتی، هەستی کوردایەتی‌و نیشتمان‌پەروەری کەوتە ناو مێشکمەوەو باوەڕم هاتە سەر ئەوە کە دەبێ لاوی کورد ئامادە بێت‌و لە کاتی پێویستیدا گیانی خۆی بۆ وەدەستهێنانی ئازادی‌و سەربەستی نیشتمانەکەی بەخت بکات. ئەو کاتە بوو کە لە حیزبی هیوادا بە ئەندام وەرگیرام. لە ساڵی ١٩٤٦دا ئاڵای کوردستان بە ناوی کۆماری مەهاباد لە کوردستانی ئێران بەرز کرایەوە. بڕیارمدا خۆم بەشداری ئەو خەباتە بکەم‌و بڕۆم بۆ بەرەی شەڕ. ئەو کاتە بەرەیەکی شەڕ لە ناوچەی سەردەشت کە زۆر لە ئێمەوە نزیک بوو، کرابۆوە. من هەر ئەو ساڵە تەنیا دوومانگ بوو ژنم هێنابوو و نەبووبوومە خاوەنی منداڵ‌و برایەکانیشم هێندێ گەورەبیوون‌و دەیانتوانی لە گەڵ باوکم ئیدارەی ماڵ هەڵبسوڕێنن. ژنەکەم کە کچی مامم بوو، ناردمەوە ماڵی باوکی‌و لە ٢٠ی مایسی ساڵی ١٩٤٦ خۆم ئامادە کردو بە بێ ئاگاداری باوکم، دوو ئەسپی سواریم بۆ خۆم‌و بۆ بابەکری سۆفی هەباس کە ئەویش هەر خزمی خۆم بوو لە گەڵ ئێسترێکی بار بۆ هەڵگرتنی کەل‌وپەل‌و

خواردەمەنی تەرتیب کرد. لە نیوەی شەودا بە نەهێنی کەوتینە ڕێگاو بۆ بەیانیەکەی گەیشتنە گوندی "بێوران"و لەوێ چەند کەسێک لە گەنجو خوێنگەرمەکانی ئەو ناوچەیە هاتنە لامو بە چەکی خۆیانەوە هاتنە ڕیزی ڕێکخستن. بۆ ڕۆژی دووەم گەیشتینە گوندی "میرشێخ حیدەر" نیزیکی بارەگای "زێرۆبەگ" فەرماندەی گشتی بەرەی سەردەشت. ناوبراو لە عەشیرەتی هەرکیو لە ناوچەی ڕەزائیە (ورمێ) دادەنیشتو لەو بەرەیە سەرۆکایەتیی کاروباری پێشمەرگەی دەکرد. لە گوندی میرشێخ حیدەرەوە نووسراوێکم بۆ زێرۆبەگ ناردو لە هاتنی خۆم ئاگادارم کردو داواشم لێ کرد بەرە (جبهە)مان بۆ دیار بکات. ئەویش لە وەرامی نامەکەمدا داوای لێکردبووم خۆم بچمە لایو کاتێ گەیشتم زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنی کردمو شادمانی خۆی پێشاندا کە من لە کوردستانی عیراقەوە هاتوومو بەشداری بەرەی شەڕ دەکەم. داوای لێکردم کە هەر لە نیزیک بارەگایەکەی خۆی بارەگا بکەمەوە. لە سەرقسەی زیرۆبەگ کە بارەگاکەی بەرامبەری سەردەشتو زۆر لە بەرەی شەڕ نیزیک بوو، هەر لەوێ نیشتەجێ بوین. ئێمە هەتا چوار پێنج ڕۆژ خۆمان خواردەمەنیمان دەکڕی. کاتێ زێرۆبەگ خەبەری زانی، خۆی هاتەلامو گوتی دەبێ لەمەودوا هەموو خواردەمەنیو پێویستیتان وەک ئەو هەموو لەشکرەی کە لەو بەرەیە دایە، لە عەمباری گشتی وەربگرن. بەهەر حاڵ نێوانمان لە گەڵ زێرۆبەگ زۆر خۆش بوو. ئەگەر ڕۆژێک نەیدیتبام، خۆی دەهاتە لامو هەر جارە پۆستەی کۆمیتەی ناوەندی لە مەهابادەوە بۆ هاتبایە، هەتا نەیهێنابایە لای من نەیدەکردەوە. دەبوایە جوابەکانیشی بۆ بنووسمەوە. ئەمەش ئەوپەڕی متمانەیەک بوو کە سەبارەت بە من هەیبوو. ئەو خۆی کاتبێکی هەبوو، بەڵام لە خوێندنەوەو نوسینی زمانی کوردی زۆر کزبوو. ئەو کاتەش دەبوایە هەموو نووسراوێکی ڕەسمی بە کوردی بنووسرێت. زێرۆبەگ خۆی نەخوێندەوار بوو، تەنیا بەزیرەکیو ئازایەتی خۆی گەیشتبووە پلەی فەماندەی بەرە. خەڵکی ناوچەی سەردەشتو هەموو عەشایرەکان پشتیوانیان لە کۆماری کوردستان دەکردو زۆربەی زۆری خەڵک لە دژی ڕژیمی تاران چەکیان هەڵگرتبوو. تەنیا دووکەس

هەبوون کە بە ئاشکرا دژی کۆمار بوونو لە سوودی رژیم چەکیان وەرگرتبوو و خۆیان خستبووە ناو سوپای ئێرانەوە. یەکەمیان "حەسەنئاغای بێزیلە"و دووەمیان " مامەندی حاجی هەباسئاغا" برازای بابەکر ئاغا بوو. مامەندئاغا خۆی لە ناوچەی ئالانی کوردستانی ئێران دادەنیشیتو بابەکرئاغاش لە پشدەرەوە هێندێ چەکداری بۆ ناردبوو تاکو بتوانن پشتیوانی لە هێزەکانی سوپای ئێران بکەن. بابەکرئاغا بە فەرمانی ئینگلیزەکان ئەو کارەی دەکرد. هۆیەکەیشی ئەوەبوو، ئینگلیزو ئەمریکا ئەو ناوچەیان بە بەشێک لە باشوری ئێران دەزانی کە لە دابەشکردنی ئێران لە گەڵ روسیادا بەر ئەوان دەکەوت. بەڵام هەڵوێستی مەحموودی حاجیئاغای هێرۆ بە پێچەوانەی هەڵوێستی بابەکرئاغا بوو. مەحموود ئاغا هەموو جۆرە هاوکاریەکی لە گەڵ کۆماری مەهابادا دەکردو هەروەکو پێشتر باسمان کرد، پەنجا تا شەست چەکداری خۆی بە هەموو خەرجو سەرفیاتەوە بۆ پشتیوانی لە کۆماری کوردستان ناردبووە بەرەی سەردەشتو هەمیشە بە نامە پەیوەندیشی لەگەڵ قازی محەممەد هەبوو. قازی محەممەد چەکێکی تایبەتی وەکو دیاری بەشێوەیەکی نهێنی لە رێگای زێڕۆبەگەوە بۆ مەحموودئاغا ناردبوو. لەبەر ئەوە قازی ئەو چەکەی بە نهێنی ناردبوو، چونکە بابەکرئاغا یەک دوو جار لای ئینگلیزەکان شکایەتی لە مەحموودئاغا کردبوو، پێی گوتبوون مەحموودئاغا بۆتە "شیوعی"و پەیوەندی لەگەڵ کۆماری کوردستان لە مەهاباد هەیە . لەبەر ئەوە مەحموودئاغا کەوتە ژێرچاودێریو لێکۆڵینەوە، پاشان بە پارەو بەرتیل توانی خۆی رزگار بکات. ئەو کاتە حکومەتی عیراقیش لە ناوچەی پشدەردا دەستەڵاتێکی وای نەبوو.

### کۆماری مەهابادو چۆنیەتی دامەزرانی

لێرەدا کورتەیەک سەبارەت بە دامەزرانو تێکچوونی کۆماری کوردستان لە مەهاباد دەخەمە بەرچاوی خوێنەران کە بریتییە لەو رووداوانەی خۆم دیتومنو لە ناویاندا ژیاوم یا لە کەسانی باوەڕپێکراوی ناوکۆمارو لێپرسراوانی

ناسیاو بیستوومن. هەر ئەو کات ناوی ئەو سەرچاوانەم یادداشت کردووە کە سەرچاوەکان ئەوانەی خوارەوەن:

١- زێرۆ بەگی هەرکی کە لە سەرەتاوە ئاگاداری زۆربەی رووداوەکان بووەو یەکێک لە ئەندامانی وەفدی کوردی بۆ "باکۆ"ی ناوەندی کۆماری ئازەبایجانی سۆڤیەت بووە.

٢- سەید مستەفای سەیدی، خەڵکی مەهاباد کە لە پاش روخانی کۆماری کوردستان لە مەهاباد رای کردو پەنای بۆ مەحموودئاغای هێرۆ هێناوە.

٣- کاپیتان "حمەی مەولود" خەڵکی مەهاباد کە ئەویش بۆ ماوەیەک هاتە عیراق‌و لە دوایدا رویشت بۆ روسیا .

٤- حاجی سەید رەحیم، خەڵکی مەهاباد کە ئەندامی بەرزی حیزب بوو، لە بەرەی سەردەشت کرابوو بە بە لێپرسراوی دارایی.

٥- حامیدی مازوجی خەڵکی مەهاباد کە خۆی لە کۆماری مەهاباد سەرۆکی دیژبان (ئامر ئینزبات) بوو، لەگەڵ قازی محەممەد لە سێدارە درا.

ئاگاداریەکانی خۆم‌و ئەوەی لەو سەرچاوانەم بیستوە، هەمووی بەبێ زیادوکەم دەخەمە بەرچاوی خوێنەری خۆشەویست.

لە ساڵی ١٩٤١دا هاوپەیمانان (روس، ئینگلیزو ئەمریکا) هاتنە ناو خاکی ئێرانەوەو رەزاشایان بە تاوانی نازییەتی لەسەر حوکم لابردو بۆ دەرەوەی ئێران دووریان خستەوە. بۆ ئەوەی رژیمی پاشایەتی لە ئێران تێک نەچێت، حەمەرەزای کوریان لە جێگا دانا. هەروەها خاکی ئێرانیشیان بەسەر دووبەش‌دا دابەش‌کرد. یەکەم ناوچەکانی ئازربایجان کە دەکەوێتە باکوری رۆژئاوای ئێران، هەمووی خرایە ژێر دەستەڵاتی روسیاوەو بەشی دووەم کە بریتی بوو لە ناوەراست‌و رۆژهەلات‌و خواروی باشوری ئێران، هەمووی خرایە ژێر دەستەڵاتی ئیگلیزو ئەمریکا. لە روی سیاسیەوە خۆیان چاوەدێریان دەکردو نەیاندەهێشت کە پەشێوی‌و ئاڵۆزی بکەوێتە ئەو ناوچانەو پارچە پارچە بکرێت. سیاسەتی روسیا لەئێراندا بە پێچەوانەی سیاسەتی ئینگلیزوئەمریکا بوو. حەزی دەکرد هەر نەتەوەیەک لە ئێراندا داوای مافی ئەتەوایەتی خۆی بکات‌و لەدژی

رژیمی ئێران سەر بەرز بکاتەوە. هەر ئەوە بوو کە روسیا دەستی بە هاندانی سەرۆک خێڵەکانو دەربەگەکانی ئەو ناوچانەی ژێردەستی خۆی واتە ئازربایجانی رۆژهەڵاتو رۆژئاوا کرد، لە دژی رژیمی ئێران سەر بەرزبکەنەوەو سوپای دەستەڵاتدار لەو ناوچانە دەربکەنو خۆیان گەورەو گزیری وڵاتبن. ئەوەبوو کە هەر ئاغایەکو سەرۆک عەشیرەتێک لە شوێنەکانی خۆیان راپەرینو لە ماوەیەکی کورتدا دەستیان بەسەر هێزەکانی میری داگرتو خۆیان بوونە حاکمی سەربەخۆو ئاغایەتی سەدساڵ لەوە پێشیان ژیاندەوە. ئەوانەی کە زۆر دیارو ناسراوبوون، بریتی بوون لە:

١- عومەر خانی شکاک

٢- رەشید بەگی هەرکی

٣- قەرەنیئاغای مامەش

٤- زێرۆ بەگی هەرکی

٥- کاک عەولای جەڵدیان

٦- موساخانی زەرزا

٧- ئاغایانی دیبوکری لە ناوچەی بۆکان کە ژمارەیان زۆر بوو

هەریەک لەوانە چەکدارێکی زۆریان لە دەوری خۆیان کۆ کردەوە، چونکە پەیداکردنی چەک شتێکی زۆر ئاسان بوو، زۆربەی زۆری ئەو چەکانەیان لە سوپای ئێران بە تاڵان وەرگرت. لە شاری مەهاباد کە هەر لەکۆنەوە مەرکەزی بزوتنەوەو چالاکی سیاسی بووە، حیزبێکی سیاسی بە ناوی "کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد" لە جێگای حیزبی هیوا کەوتە ئیش کردنو زۆربەی زۆری لاوانی رەوشەونبیرو ئازادیخوازی کوردستانی ئێرانو عێراق هاتنە ناو ئەم حیزبەوەو قازی محەممەدیش کە خۆی پیاوێکی سیاسیو ئاینیی بوو، هاتە ناو حیزبو توانی لە ماوەیەکی زۆر کەمدا پلەی سیاسی ئەم حیزبە بەرز بکاتەوەو زۆربەی زۆری ئەو سەرۆکخێڵو ئاغایانەش کە باسمان کردن، بهێنێتە ناو حیزبو هەموو مانگ "پیتاک"و مانگانەیان لێوەربگرێت. حیزب خۆی جێگای حکومەتی ئێرانی پرکردەوەو توانی زۆر بە ریکوپێکی ئیدارەی شارەکانی

مەهاباد، بۆکان،میاندواو، شنۆ، نەغەدە و خانە بەرێوە بەرێتو هەموو دایرەکانی ئەو شارانە لە جاران باشتر کەوتنە ئیش کردن. هەروەها لە تەورێزیش دەستەڵاتی میری نەماو هەمو دەستەڵاتێک کەوتە ژێر دەستی "فیرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجان". ئەم فیرقەیە بە خواستی روسەکان بە بیرو باوەری کۆمونیستی هاتبوونە سەر کارو روسەکان زۆر بە توندی پشتیان گرتبوو و هەموو توانای مادیو مەعنەویان لە بەردەست نابوو. فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان شارەکانی تەورێز، مەرەند، خۆی، سەڵماس، ئەردەبیڵو مەراغەی لە دەستەڵاتی رژیمی ئێران پاک کردبۆوەو خستبوویە ژێر ئیدارەو دەستەڵاتی خۆی. ئەم شارانە هەموویان لە باکورو رۆژئاوای تەورێز هەڵکەوتوون. دەستەڵاتی ئازەربایجان لە باشووریشەوە هەتا دەگاتە میانەو تاکستانو زەنجانو نیزیکی قەزوین، دەرۆیشت.

## وتوویژ لەنێوان حکومەتی روسیاو نوێنەرانی کورد لە"باکۆ"ی پایتەخی ئازەربایجانی روسیا

لە ساڵی١٩٤٢دا حکومەتی روسیا "داوەتنامە"یەکی بۆ "کۆمەڵە" لە مەهاباد ناردو داوای لێکردن چەند نوێنەرێکی خۆیان بۆ وتوویژ دەربارەی چارەنووسی کوردی ئێران بۆ باکۆ بنێرن. ئەم داوەتنامەیە لە کاتێکدا هات کە کۆمەڵە بە ئاشکرا کاری دەکردو لە ناوەو لە دەرەوە خۆی ئیسبات کردبوو. قازی محەممەد بۆ ئەم سەفەرە وەفدێکی ٣٠ کەسی لەم پیاوە عەشایرە ناسراوەنەی خوارەوە بە سەۆکایەتی خۆی پێکهێنا:

١- حاجی بابە شێخ

٢- قەرەنیئاغای مامەش

٣- کاک عەوڵای جەڵدیان( مامەش)

٤- رەشید بەگی هەرکی

٥- زێرۆبەگی هەرکی

٦- موسا خانی زەرزا

٧-مەجیدخان میاندواوی

٨- شێخ پووشۆی کوڕی سەید تەها

٩- عەلی ئاغای ئەمری ئەسعەد

١٠- حەسەن ئاغای هەنارە( شکاک)

١١- حەسەن تیلوکە ( شکاک)

١٢- کاک هەمزەی نەلۆس ( مامەش)

من لەو سی کەسە هەر ناوی ئەوەند کەسانە دەزانم. ئەم نوێنەرانە ڕۆیشتنە باکۆو چەند ڕۆژ لە گەڵ "باقرۆف" سەرۆککۆماری ئازەربایجانی ڕوسیا وتوویژیان کردو لە سەر مافی نەتەوایەتی گەلی کورد پێیان داگرت. بەڵام نوێنەانی ڕوسیا بە سەرۆکایەتی باقرۆف هیچ بەلای مافی کوردەوە نەچون‌و گوتیان حکومەتی ڕوسیا لەم هەل‌و مەرجەی ئێستادا ئامادە نییە بۆ وەدەست هێنانی مافی نەتەوایەتی پشتگیری لە کورد بکات. ئیتر ئەم جارە بێ‌ئەوەی بگەنە ئەنجامێک، وەفدەکە گەڕاوە. تەنیا باقرۆف پێی گوتبوون داوایەکانی ئێوە دەخەینە بەرچاوی کۆمیتەی مەرکەزی‌و ئاگادارتان دەکەینەوە. پاش گەڕانەوەی نوێنەرانی کورد لە "باکۆ"، پلەی حیزب زیاتر لە جاران بەرزبۆوەو عەشایرەکان پەیتاپەیتا دەهاتنە ڕیزی ڕێکخستن‌و بەوپەڕی سەخاوەتەوە پیتاک‌و یارمەتیان بۆ حیزب سەرف دەکردو بە تێکڕای خەڵک بە هیوای داهاتنی ڕۆژێکی پڕ لە شادی‌و بەختەوەری‌و ئازادی کوردستان لە دەوری ئالای حیزب کۆبوونەوە. بە هەر حاڵ وەزع بەم‌شێوەیە ڕۆیشت هەتا گەیشتە ساڵی ١٩٤٥و حکومەتی ئێرانیش لەو ناوچانەی کوردستاندا ڕۆژبەڕۆژ لاوازتر دەبوو و بەرەو شارەکانی باشوور پاشەکشەی دەکرد. تەنیا سەقزو سنەو کرماشان بە هۆی ئینگلیزو ئەمریکا لە ژێر دەستەڵاتی حکومەتی تاراندا مانەوە.

## رۆیشتنی نوێنەرانی کورد بۆ باکۆ بۆ جاری دووەم

لە مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٤٥دا جارێکیتر نوێنەرانی کورد بانگهێشت کرانەوە باکۆ و ئەو جارە نوێنەران تێکەڵاو بوون لە خوێندەوارانی شارستانیو سەرۆک عەشیرە خاوەن دەسەڵاتەکانی وەکو:

١ - قازی محەممەد

٢ - مەناف کەریمی خەڵکی مەهاباد.

٣ - حەمە حسین خان ناسراو بە سەیفی قازی.

٤ - علی ریحانی خەڵکی مەهاباک .

٥ - کاک عەوڵای جلدیان لە عەشیرەتی مامەش.

٦ - کاک هەمزەی نەلۆس مامەش.

٧ - قاسم حاجی بایز ئاغای دێموکری.

٨ - نوری بەگی هەرکیو چەند کەسی تریش کە ناویانم بیرکردووە.

ئەو نوێنەرانە رۆیشتن بۆ باکۆو ئەو جارە هەموو داوایەکانی خۆیان بە گەلاڵەکراوی خستە سەر کاغەزو لەگەڵ نوێنەانی روسیا بە سەرۆکایەتی باقرۆف کەوتنە وتوویژو ئەم داوایەی پێشوشیان سەبارەت بە چارەنوسی گەلی کورد دووپات کردەوە. لەئەنجامدا باقرۆف پێیگوتن کە سەربەخۆیی تەواو لەم بارودۆخەی ئێستادا هیچ ئیمکانی نییە، بەڵام حکومەتی روسیا پشتیوانی لە مافی "خود مختاری" واتە حوکمیزاتی بەو مەرجە دەکات کە کوردەکان بکەونە ژێر دەسەڵاتو چاوەێری "فیرقەی دیمکراتی ئازەربایجان"ی تورکەکانی تەورێز. جگە لەوەش بەڵێنی پێدابوون هێندێ چەکو تەقەمەنیو یارمەتی مادیان پێبدات. هەوەها رایسپاردبوون کە ناوی کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد(ژ.ک) بگۆڕن بە "حیزبی دیموکراتی کوردستان". سەبارەت وتووێژەکانی نێوان وەفدەکەی کوردستانو "باقرۆف" قسەیەکی خۆش هەیە. ئەویش ئەوەیە کاک عەوڵای جەڵدیان کە خۆی یەکێک بووە لە ئەندامانی وەفدەکە، بۆی گێرامەوە: کاتێک "باقرۆف" بەڵێنی ئەوەی پێدابن چەند هەزار تفەنگو فیشەکو چاپخانەو شتمان بداتێ، قازی محەممەد رووی کردە باقرۆفو بە تورکی پێی گوت: "من زۆر

دڵخۆشم، چونکە ئەمجارە دڵنیام کە جەنابت هەموو داوایەکانی ئێمە جێبەجێ دەکەی‌و بەڵگەشم ئەوەیە دەگێڕنەوە دەڵێن ئاغایەکی گەورە هەبوو کە زۆر حەزی لە راو بە "تانجی" دەکرد. رۆژێک بە نۆکەرەکەی خۆی گوت با تانجیەکت بدەمێ. ئەویش گوتی قوربان ئەگەر لەو لوتفو کەرەمە پەشیمان نەبیتەوە، زۆر جێگای شانازیمە. ئاغا تانجیەکەی پێداو لە گەڵ خۆیدا بردیەماڵەوەو لەوێ ژنەکەی گوتی ئەوە چییە هێناوتەوە؟ نۆکەریش گوتی ئەوە لوتفی ئاغایە بۆ من هەتا راوی پێبکەم. ژنە گوتی تۆ نازانی تانجی راگرتن هەروا ئاسان نییە. پێویستیی بە ئەسپی سواری هەیەو ئەسپەکەش کاو جۆو جێگای پێویستە. ئێستا ئێمە هیچکام لەو پێداویستیانەمان نییە، کەواتە هەرچی زووتر تانجی‌یەکە بۆ ئاغا بەرەوە. کابرای نۆکەر بەقسەی ژنەکەی کردو گەڕاوە ماڵی ئاغاو گوتی قوربان زۆر سوپاست دەکەم، ئەم تانجیە بۆ من سوودی نابێ. چونکە نە ئەسپی سواری‌و نە جێگای ئەسپ‌و نە تفاق‌و خۆراکی ئەسپ بە هەژارێکی وکو من دابین ناکرێن. ئەوجار ئاغا گوتی: ها "حەمەد" ناچارت کردم ئەو شتانەت هەموو بۆ دابین بکەم."

کاتێ قازی محەممەد ئەو قسانەی بۆ باقرۆف گێڕایەوە، پێی گوت: "من دەزانم وەک ئاغایەکە تۆش هەموو داوایەکانی‌ترمان بۆ جێبەجێ دەکەی." ئەوجار باقرۆف دەستی بە پێکەنینێکی زۆر کردو بە قازی گوت ئەگەر بواری سیاسی لە ئایندەدا مەوداماں بدات، بەسەرچاو.

لێرەدا گێڕاوەی کاک عەولای جەلدیان تەواو دەبێت. من لە ساڵەکانی ١٩٧٥ و ١٩٧٦ کاتێ ماڵم لە ورمێ بوو، زۆر هاتو چۆمان لە گەڵ خوالێخۆشبوو کاک عەولای جەلدیان هەبوو. هەر لە زەمانی کۆماری مەهابادیشەوە دەمناسی‌و ئەو باسی ئەو سەفەرانەی "باکۆ"ی بۆ گێڕامەوە.

ئەوە بوو نوێنەرانی کورد گەڕانەوە مەهابادو لەکۆتایی مانگی تشرینی ساڵی ١٩٤٥دا کۆبوونەوەیەکی فراوان پێکهات‌و ژمارەیەکی زۆر لە رەوشنبیران‌و سەرۆک خێڵەکانی کوردستانی ئێران لەو کۆبونەوەیەدا بەشداریان کرد. قازی محەممەد سەبارەت بە وەزعی سیاسی کوردستان‌و ئەنجامی سەفەرەکەیان بۆ

روسیا کەوتە قسەکردن. هەروەها پێشنیارەکانی باقرۆفی لە بابەت خودمختاری‌و گۆڕینی ناوی "کۆمەڵە" بۆ باسکردن. پاش ئاڵوگۆڕی بیروڕا، زۆربەی زۆری خەڵک بە مافی ئەو خودمختارییە رازی نەبوون کە لە ژێر دەستەڵات‌و چاوەرێری "فیرقەی دیمکراتی ئازەربایجان" دابێت‌و کەس لە مافی سەربەخۆیی کەمتر نەدەهاتە خوارەوە. بەڵام دەربارەی گۆڕینی ناوی کۆمەڵە بە حیزبی دیموکراتی کوردستان، هەموو کەس پێی باشبوو. بڕیاری لە سەردراو ئەو ناوە جێگای خۆی گرت‌و دروشمی حیزبی دیموکرات بەرز کرایەوە. لەم کۆبوەوەیەدا قازی محەممەد پێشنیاری کرد کە باشتر ئەوەیە ئێمەی کورد نێوان‌و پەیوەندی خۆمان لەگەڵ "فیرقەی دیموکراتی تەورێز" پتەوتر بکەین‌و ماوە نەدەین کە حکومەتی روسیا لەو بارەیەوە رەخنەمان لێبگرێت. ئەمجا بڕیار درا کە وەفدێکی تایبەتی بە سەرۆکایەتی قازی محەممەد بڕواتە تەورێزو هەرچۆنێک بێت دڵی تورکەکانی تەورێز لە خۆیان رازی بکەن. لەو کاتەدا هێندێ ناکۆکی‌و کێشەش کەوتبووە مابەینی 'فیرقەی دیموکراتی تەورێز"و سەرۆک عەشایرەکانی ناوچەی رەزائیە، بە تایبەتی لەگەڵ شکاک‌و هەرکیەکان. ئەو وەفدەی بۆ چارەسەری ئەم کێشەو ناکۆکیانە بەرەو تەورێز وەرێکەوت، لەو کەسانەی خوارەوە پێک هاتبوو:

١ - قازی محەممەد

٢ - سەید عەبدوڵلا ئەفەندی

٣ - حەمەحوسێن خان

٤ - رەشید بەگی هەرکی

٥ - عومەر خانی شکاک.

لە نوێنەرانی "فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان" تەنیا هەر ناوی جەعفەر پیشەوەری‌و دکتۆر جاوید دەزانم.

نوێنەرانی هەردوو لا لە تەورێز دانیشتن‌و چەند رۆژ وتووێژیان کرد. لە ئەنجامدا لەسەر ئەم خالانەی خوارەوە پێکهاتن‌و بڕیارنامەیەکیان بەو شێوەی خوارەوە مۆر کرد:

١- هەردوو حیزب بۆ پاراستنی وڵات هاوکاری یەکتر بکەن‌و لە هیچ جۆرە یارمەتەکی سیاسی‌و عەسکەری‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی لەگەڵ یەکتردا درێغی نەکەن.

٢- وتووێژکردن لەگەڵ حکومەتی مەرکەزی تاراندا دەبێ بە پرس‌و رای یەکترو رەزامەندی هەردوو حیزب بێت.

٣- ئەم دوو حیزبانە هەریەک لە ناوچەی خۆیدا بۆ گەشەپێدانی زمانی کوردی‌و تورکی هەوڵ بدەن.

٤- لە هەر ناوچەیەکدا کە ژمارەی تورک لە هی کورد زیاتر بوو، دەبێ سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەرایەتی ئەو ناوچەیە تورک بێت‌و نیسبەت بە کوردیش هەر هەمان شت لە ناوچەکانی تێکەڵاو پەیرەوی بکرێت.

٥- لێژنەیەکی هاوبەشی ئابووری لە هەردوو حیزب بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتە ئابووریەکان پێک بهێنرێت‌و بڕیارەکانی ئەو لێژنەیەش لە لایەن هەردوو حیزبەوە ڕێزی لێ‌بگیرێت.

6- لە هەر شوێنێک ئاژاوەو دووبەرەکی لەنێوان کوردەکان‌و تورکەکاندا دروست بوو، پێویستە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە دەستەڵاتی هەر دوو حیزب بەکاربهێنرێت‌و ماوە نەدەن هیچ جۆرە ئاژاوەو دووبەرەکی لە ناوچەکانی تێکەڵاوی وەک "رەزائیە"، "نەغەدە" و "میاندواو" و ئەمانەدا دروست ببێت.

ئیتر بەم‌شێوەیە پێکهاتن‌و نوێنەرانی کورد گەڕانەوە مەهابادو حکومەتی روسیاش بەم بڕیارنامەیە زۆر رازی بوو و رەزامەندییەکەی بە هەردوو لا راگەیاند.

## چەکو تەقەمەنی لەلایەن روسەکانەوە بۆ یەکەمجار گەیشتە شاری مەهاباد

پاش ئەوەی قازی‌محەممەدو نوێنەرانی کورد لە تەورێز گەڕانەوە، وەجبەیەک چەکو تەقەمەنی بۆ یەکەمجارو زۆر بە نهێنی گەیشتە مەهابادو روسەکان بە دیاری ناردبوویانو لە کاتی نیوەشەودا دایانبەزاندن. چەکو تەقەمەنیەکان بریتی‌بوون لەو شتانەی خوارەوە:

١- ١٢٠٠ تفەنگی برنۆ لەگەڵ چەند شەستیرو فیشەکی زۆر.

٢- وەجبەیەک نارنجۆکی" مۆلۆتۆف"و هەروەها چەند هەزار شووشە "تیزاب" کە بۆ سووتاندنی دەبابە ( تانک) بە کار دەهات و دەبوایە پێشمەرگەی گیان‌فیدا لە نزیکەوە بیخاتە سەر دەبابە.

٣- مەبلەغێک پارە ( ئیسکناس)ی ئێرانی.

٤- چاپخانە لەگەڵ کاغەزو کەل‌وپەلی پێویست.

کاتێ ئەو چەکانە هاتنو بەسەر ئەندامانو لایەنگراندا دابەشکران، هەموو جەماوەر کەوتە شاییو بەزمو پەیتاپەیتا خەڵک بۆ چەکوەرگرتن دەهاتنو ئامادەیی خۆیان بۆ گیان‌بەخت‌کردن لە رێگای ئازادی کوردستان پێشان دەدا. وای لێ‌هادت خەڵک لە کوردستانی عێراقەوە دەهاتنو ئەگەر یەکێک لەدانیشتوانی مەهاباد بوبایە کەفیلیان چەکیان پێدەدراو ناویان لەریزی لەشکری کوردستاندا تۆمار دەکرا. پلەی حیزب گەیشتە ئەوپەڕی بەرزیو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی هاتنە ئەو رادەیەی کە زۆر لە خۆیان بایی بنو داوای ئیعلانی سەربەخۆیی (ئیستقلال) بکەن. بەڵام قازی محەممەد ئەو رایەی پەسند نەکرد، چونکە خۆی لەم گەشتانەی‌دا بۆ روسیا تێگەیشتبوو کە حکومەتی روسیا بۆ جاڕدانی سەربەخۆیی پشت‌گیرییان لێ‌ناکات. مەسەلەش هەر ئەوەبوو کە روسیا هەوڵی ئەوەی دەدا کارێکی وا بکات حکومەتی ئێران بخاتە ژێر گوشاری سیاسیو ناچارببێت "ئیمتیازی" نەوتی باکووری ئێران وەک بەرتیل بداتە روسیا. هەر بەو مەبەستەش روسیا هەر لە سەرەتاوە هانی

سەرۆک عەشیرەتەکانی کوردی دا بۆ داواکردنی مافی نەتەوایەتی‌و پشتی ئەحزابە سیاسیەکانی تورک‌و کوردیشی گرت. ویستی حکومەتی ئێران بترسێنێت‌و ئەمانەی باسمان کردن وەکوو "بێچووە گورگ" پێشانی ئێران بدات. بەڵام حکومەتی ئێران کە "قەوامولسەڵتەنە" سەرۆک وەزیرانی بوو، وا بە ئاسانی نەچووە ژێر باری گرانی روسیا. چونکە نەیدەزانی لە کاتی تەنگانەدا ئینگلیزو ئەمریکا پشتیوانی لێ‌دەکەن‌و ماوە نادەن کە ئەم داوایەی روسیای لەسەر فەرز بکرێت. ئەم کۆنەگورگە فێڵبازە واتە "قەوامولسەڵتەنە" کارێکی وای کرد کە پێویست نەکات ئەو کێشەیە وا گەورە ببێت کە ئینگلیزو ئەمریکا بکەونە ناو کارەکەوە. هەر جارەی بە بیانوویەک روسەکانی تەفرە دەداو دەیخافڵاندن‌و نەیدەویست بە تەواوی بێ‌هیوایان بکات.

راستی ئەم وتووێژە نهێنیەی مابەینی روسیاو قەوامولسەڵتەنە سەبارەت بە "ئیمتیازی" نەوتی باکور یەکەمجار زۆر خەڵک نەی‌دەزانی، چونکە روسەکان زۆر بە نهێنیان گرتبوو، بەڵام نوێنەرانی کورد هەر ساڵی ١٩٤٢ کە بە سەرۆکایەتیی قازی محەممەد رۆیشتنە باکۆ، ئەم راستیەیان بۆ دەرکەوتبوو کە روسیا خەریکی بەرێوەبردنی سیاسەتێکی تایبەتی خۆیەتی‌و مەبەستی نییە داخوا نەتەوەکانی ئەو ناوچەیە مافی خۆیان وەدەگرن‌و یا دەکەونە ژێر چەپۆکی حکومەتی ئێران. قەرەنی‌ئاغای مامەش کە یەکێک بوو لە نوێنەرانی بەرزی ئەم وەفدە و زۆر کۆن‌و دونیا دیدەش بوو، هەر لە کاتی گەڕانەوەدا گوتبووی من هیچ متمانەم بە حکومەتی روسیا نییەأو دەترسم رۆژێ لە رۆژان بمانخەنە بازاری مامڵەو بمانفرۆشن. قاسمی حاجی بایز ئاغای دێموکریش لە سەفەری دووەمدا هەر ئەو قسەیەی قەرەنی‌ئاغای کردبوو. لەگەڵ ئەمەشدا قازی محەممەدو نوێنەرانی‌تری رەوشەنبیر نەیاندەویست بە ئاشکرا دان بەو راستیە دابنێن، چونکە لە بواری سیاسیەوە بە سوودی حیزب نەبوو باسی شتێک بکرێت کە ئێستە روی‌نەداوە و نازانرێ چۆن دەبێت.

## هاتنی بارزانی‌یەکان بۆ ئێران

بارزانی‌یەکان کە بە سەرۆکایەتی مەلامستەفای بارزانی لە دژی رژێمی پاشایەتی لە عێراق شۆڕشیان دەست پێکردبوو، پاش چەند شەڕو لێکدانو هێرشی بێ‌ئەمانی دوژمن ناچاربوون خاکی کوردستانی عیراق جێبهێڵنو بەرەو سنووری ئێران بێن. بارزانیەکان خۆیان گەیاندە مەهابادی ئازادکراو. لە سەرتای مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٤٥دا بە خاوخێزانیانەوە گەیشتنە مەهاباد. ژمارەیان بە تێکرایی دەگەیشتە شەش حەوت هەزار کەسو لەلایەن حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەوە زۆر بەخێرهاتنی گەرمیان لێکراو هەرچی لە تواناد‌ا هەبوو بۆ دامەزراندنی خاوخێزانو دابینکردنی ژیانیان درێغی نەکرا. روسەکان یەکەمجار رایان لەسەر مەلامستەفا باش نەبوو. بە جاسوسی ئینگلیزیان دەزانیو بە قازی محەممەدیان گوت کە دەبێ مەلامستەفا بخەنە ژێر چاوەدێری. بەڵام قازی محەممەدو ئەندامانی حیزب، بە تێکرایی رایان وا نەبوو. مەلامستەفایان بە کوردیکی پاکو دڵسۆز دەناسیو بە پشتیوانی راستەقینەی حیزبی دیموکراتی کوردستانیان دەزانی. ماڵە بارزانی‌یەکان لە دێهاتی دەوروبەری "سندووس"و مەهاباد دامەزران. ماڵی مەلامستەفاشیان لەگەڵ ئەو ئەفسەرە عیراقیانەی کە لەگەڵیدا هاتبوون، هێنایە ناو شاری مەهاباد. ئەفسەرەکان ئەمانە بوون:

١- میرحاج

٢- عێزەت عەزیز

٣- مستەفا خۆشناو

٤- محەممەد قودسی

٥- خیروڵلا

٦- نوری ئەحمەد تەها

٧- بەکر ئاغا ناسراو بە رەئیس بەکر

٨- عەبدولرەحمان موفتی

کاری هەریەک لەو ئەفسەرانە لە کۆماری کوردستاندا دەستنیشان کراو بڕیاریاندا سوپایەکی نیزامی کوردی دروست بکرێتو ئەم ئەفسەرانە بکەونە ڕێکخستنو مەشق پێکردنی ئەم سوپا تازەیە. لەسەر بارەگای ئێرانیەکان کە چۆڵیان کردبوو، مەرکەزی مەشقکردن کرایەوەو دەست بە وەرگرتنی سەرباز بە شێوەی ئیختیاری کرا.

چونکە پلەی ئابووری حیزب ئەوەندە بەرز نەبوو کە بە هەموو خەرجو سەرفیات رابگات، ژیانی بارزانیەکان لە دێهاتەکان وەکو پێویست باش نەبوو. تەنیا هەر ئەوە بوو کەوا بارزانیەکان فێری ژیانی "کولەمەرگی" واتە "مەمرە مەژی" ببوونو بە هەمووشت رازی بوون. خۆم هێندێ لە پیاوەکانی ئەوانم دەدیت کە لە "هاوین"دا کاڵەی چەرمی گاجووت یان کاڵەی "موو"یان دەکردە پێی. هەروەها ژنو منالیان زۆری روتو پێخاوس بوون. مەلامستەفا ئەو کاتەی گەیشتە مەهاباد، وەکو فەرماندەیەکی ئازاو شەڕکەر دەناسرا، نەک سەرۆکی عەشیرەتی بارزان، چونکە ئەو کاتە شێخ ئەحمەدی برا گەورەی مەلامستەفا سەرۆکی عەشیرتەکەیان بوو و هەمیشە بە خودانی بارزان ناویان دەبرد. شێخ ئەحمەد نەیدەویست بێتە مەهابادو ماڵی لە "نەغەدە"" مایەوە. "حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران" بە هاتنی بارزانیەکان زۆر پشتئەستوور بوونو زیاتر لە جاران هەوای سەربەخۆیی کوردستانیان خستە ناو مێشکی خۆیانو دەیانگوت ئەگەر هیچ حکومەتیش لە جیهاندا پشتگیری ئێمە نەکەن هەر خۆمان بەو چەکدارە زۆرەی هەمانە، دەتوانین شەڕی حکومەتی ئێران بکەینو خۆمان بپارێزین. راستی ئەگەر سەیری مێژوو بکەین، دەبینین کە گەلی کورد هەروا بووەو لە کۆنەوە بە بچووکترین سەکەوتن تووشی لە "خۆبایی بوون " بووەو کەسی بە هیچ نەزانیوە کە ئەمەش شتێکی راست نییەو بە کارێکی دووربینانە ناژمێرێت.

## جاڕدان (ڕاگەیادن)ی کۆماری کوردستان لە مەهاباد

هەرچەند هەڵویستی حکومەتی روسیا بەو شێوەیە بوو کە لە پێشەوە باسمان کردو ئامادە نەبوو بۆ وەدەستهێنانی مافی سەربەخۆیی پشتیوانی لەگەلی کورد بکات، بەڵام حیزبی دێموکراتی کوردستان گەیشتبووە ئەو باوەڕە کە گەلی کوردی ئێران بێئەوەی کەس پشتیوانی لێبکات، ئەو توانایەی هەیە ئازادیو سەربەخۆیی نیشتمانەکەی بە خوێن بپارێزێت.

لە ٢٢ی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٦دا کاتی پێشنیوەڕۆ، هەموو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەگەڵ خەڵکی شاری مەهاباد کە بە تایبەتی بۆ ئەورۆژە بانگهێشتن کرابوون، لە مەیدانی چوارچرای شاری مەهاباد کۆبوونەوەو لە دوای خوێندنەوەی سروودی "ئەی رەقیب هەر ماوە قەومی کورد زوبان" کە گوێچکەی ئاسمانی کەڕ دەکرد، ئاڵای سێ رەنگی کوردستان بەرز کرایەوە. ئەو ئاڵایە کە بە دروشمی دوو گوڵی گەنمو قەڵەم رازابۆوە، لە ناو ئەو هەموو جەماوەرو حەشیمەتەدا دەشەکایەوە. لە هەموو لایەک بوو بە چەپڵەڕێزان. ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی رۆیشتنە ماڵی قازی محەممەدو لەوێوە بە شێوەیەکی نیزامی قازی محەممەدیان خستە ناوخۆیانو هێنایانە سەر ئەو سەکۆیە کە بەتایبەتی بۆ وتاری قازی ئامادە کرابوو. ئەوسا قازی محەممەد زۆر بەهێواش کەوتە قسەکردن. کورتەی قسەکان بریتیبوو لەوە کە گەلی کورد هەمیشە ژێر دەستو بەدەستی چەپەڵی داگیرکەرانەوە چەوساوەتەوەو چەندەها جاریش راپەڕیوەو لە پێناوی وەدەستهێنانی ئازادی و سەربەخۆییدا فیداکاریو گیانبازی کردووە، بەڵام هەرجارە لەلایەن دوژمنانو داگیرانەوە مافی پێشێل کراوەو سەرکوتیان کردووەو نەیانهێشتووە داری ئازادییەکەی بەر بگرێتو گەلی کورد بگاتە ئاواتی خۆی. ئێستەش کەوا لەشاری مەهابادی کوردستانی ئێراندا ئاڵای سێرەنگی کوردستان بەرز کراوەتەوە، هیچ پشتیوانو یارمەتیدەرێک بۆ کورد نییە جگە لە دۆستی مەزنو قارەمان زیاتر کە ئەویش یەکێتی شورەوی

(روسيا)یە. ئێمە هەر بە هیوای ئەوین کە پشتی ئێمە بەرنەدات هەتا دەمانگەیەنێتە دوا قۆناغی ئازادیو رزگاری.

دوای ئەوەی کە قازی محەممەد وتارەکەی کۆتایی پێهێنا، هەریەک لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیو سەرۆک عەشیرەتەکانو ئەشخاسی ناسراوی شاری مەهابادو شارەکانی‌تری کوردستانی ئێران هەستان پیرۆزبایی گەرمیان لێکردو ناویان لێنا (پێشەوای موعەززەم). سەرۆک کۆمارییەتی قازی محەممەد بە پێی هەڵبژاردن نەبوو، تەنیا هەر ئەوەبوو کە ناوبراو لە ناو جەماوەری کوردستانی ئێراندا خاوەنی مەرکەزێکی سیاسیو ئایینیو کۆمەڵایەتی بوو. تاکە کەسێکی‌تر کە ویستبای بەرامبەربە قازی محەممەد بوەستێتو لای خەڵکیش زۆر خۆشەویستو رێزلێگیراوبێت، تەنیا سەید عەبدوڵلا ئەفەندی بووە. ئەویش نەوەی شێخ عوبیدوللای نەهری‌یە کە لەساڵەکانی ١٨٨٠دا شۆرشی دژی تورکیاو ئێران بەرپا کردووە. ئەگەر دانانی سەرکۆمار بەپێی هەڵبژاردن بوایە، هیچ دوور نەبوو کە دەنگی سەید عەبدوڵلا ئەفەندی لە هی قازی محەممەد زۆرتر بێت. بەڵام وەکو دەمانبیستو لەناو خەڵکدا باس دەکرا، روسەکان خەزیان لە سەید عەبدوڵلا ئەفەندی نەدەکردو بە ئینگلیزخوازیان دەزانی.

ئەوەی کە لە کاتی ئاهەنگی چوارچرادا جێگای سەرسوڕمانی خەڵک بوو، ئەوەبوو کە نوێنەرانی دایمی روسیا لە رەزائیەو مەهاباد "هاشم ئۆف"و "ئەسەد ئۆف" هیچ‌کامیان تا ئەو رۆژە خۆیان پێشانی خەڵک نەداو بەشداری ئەو ئاهەنگەیان نەکرد. مەسەلەکە وا لێکدرایەوە کە روسەکان ویستیان خۆیان بە جۆرێکی وا پێشانی حکومەتی تاران بدەن کە بە راگەیاندنی کۆماری کوردستان رازی نینو لە بەرامبەر حکومەتی تاراندا بیکەن بە بەڵگە. واش پێ دەچێ کە روسەکان پێشترێ بە قازی محەممەدیان راگەیاندبێت کە نوێنەرانیان لەو ئاهەنگەدا بەشدار نابن. ئەگینا قازی محەممەد خۆی بە رەسمی بانگهێشتی دەکردن. ئەم دوو نوێنەرانەی روسیا هەردوکیان ئەو رۆژە لە مەهاباد بوونو بێ ئەوەی خۆیان ئاشکرا بکەن، بە نهێنی لە ناو باغەکانی خواروی "چوارچرا" سەیری ئاهەنگەیان کردبوو.

## دانانی "کابینە" لە کۆماری کوردستان

پاش ئەوەی کۆماری مەهاباد ڕاگەینرا، کۆمیتەی ناوەندی چەند کۆبوونەوەیەکی سەبارەت دانانی وەزارەت پێکهێناو لە ئەنجامدا ئەوانەی خوارەوە وەک ئەندامانی کابینە دانران:

١- حاجی بابەشێخ سەرۆکی وەزیران، خەڵکی گوندی "زەمبیل"ی بۆکان

٢- حەمەحوسێن خان ناسراو بە "سەیفی قازی"، وەزیری بەرگری

٣- مەنافی کەریمی خەڵکی مەهاباد، وەزیری زانیاری

٤- سەید محەممەدی ئەییوبیان خەڵکی مەهاباد، وەزیری تەندروستی

٥- ئەحمەدی ئیلاهی خەڵکی مەهاباد، وەزیری ئابووری

٦- خەلیل خوسرەوی خەڵکی مەهاباد، وەزیری کار

٧- کەریمی ئەحمەدیان خەڵکی مەهاباد، پۆستە و تەلگراف

٨- حەمەدەمین مەعیشی خەڵکی مەهاباد، وەزیری ناوخۆ

٩- مەحموود وەلیزادە خەڵکی مەهاباد، وەزیری کشتوکاڵ

١٠- ئیمساعیل ئیلخانیزادە خەڵکی بۆکان، وەزیری ڕێگاوبان

١١- مەلاحوسێن مەجدی ئیمام و خەتیبی مزگەوت، وەزیری دادپەروەری

١٢- عەبدوڕەحمان ئیلخانیزادە خەڵکی بۆکان، وەزیری دەرەوە

ئیتر بەم شێوەیە وەزارەتەکان دانران و هەرکەس دەستی بە کاری ڕەسمی خۆی کرد.

ئەوانەی کە ڕوتبەی ژنراڵیشیان لە لایەن ڕوسەکانەوە پێدرابوو، بریتیبوون لەوانەی خوارەوە:

١- حەمەحوسێنخان سەیفی قازی

٢- عومەرخان شکاک

٣- مەلامستەفای بارزانی

٤- حەمەڕەشید خانی بانە

ئەو ئەفسەرانەش کە وەکو دەستەی ئەرکانی سوپا دانرابوون ئەمانە بوون:

١- جەعفەری کەریمی دیمۆکری ئاغای (قونقەلا)

٢- مستەفا خۆشناو ئەفسەری عیراقی

٣- محەممەد قودسی ئەفسەری عیراقی

ئەمانە بە تایبەتی بۆ ئەوە تەرخانکران سەربازەکان رێکبخەن‌و بە مەشق‌و فێرکردنی چەک رایانبهێنن. ژمارەی ئەفسەرەکان لە سوپای "کۆمار"دا گەیشتبووە شەست تا حەفتا ئەفسەرو دەرەجەداریش سەد تا سەدوبیست‌و سەربازیش لە هەزاروسەد تا هەزارودووسەد کەس بوون.

ئەفسەرێکی روسیش بە ناوی "سەلاحەدین" ناسراو بە کاک ئاغا وەکو شارەزایەکی سوپا بۆ رێکخستن‌و چاودێری‌کردنی ئەم سوپا تازەیە لە مەهاباد نیشتەجێ ببوو. دەربارەی زیادکردنی ژمارەی ئەفسەرو سەرباز بۆ ئەم سوپایە هەرچەندە کە داخواز زۆر هەبوون‌و لاوەکانی خوێنگەرم لە کوردستانی ئێران‌و عیراق پەیتاپەیتا دەهاتن کە خۆیان بخەنە ناو سوپای کوردستان‌و بەشداری شەرەفی رزگاری نیشتمان بن، بەڵام توانای مادی ئەوەندە نەبوو کە بودجەیەکی زۆرباش بۆ سوپای کوردستان دابنرێت‌و هەرچی زووتر ئەم سوپایە زیادتر پتەو بکرێت، چونکە کۆماری مەهاباد جگە لەو شتانەی خوارەوە هیچ دەرامەدو واریداتی‌تری نەبوو:

١- کومرگ

٢- زەرایب(مالیات)

٣- ئابوونەی حیزب

پیتاک‌و یارمەتی ئەو عەشایرانەی کە خاوەنی گوندی زۆرو کشتوکاڵ بوون. بۆیە کۆماری کوردستان ناچاربوو دەربارەی زیادکردنی سوپای کوردستان زۆر پەلە نەکات‌و لە کاتی پێویستدا بۆ بەرەکانی شەڕ لەشکری عەشایری بەکار بهێنێت. راستی عەشایرەکان زۆر ئامادەو فیداکارانە بۆ خزمەتی کۆمار هاتبوونە پێشەوە.

## رۆژنامەو گۆڤارەکانو جۆری سیاسەتی "کۆماری کوردستان"

لە ناو کۆماری مەهاباددا بزووتنەوەی "رەوشەنبیریو راگەیاندن" زۆر لاواز بوو و نەگەیشتبووە ئەو پلەیە کە بەڕێوەبەرایەتیەکی تایبەتی هەبێتو وەک پێویست دەوری خۆی بنوێنێتو وەک چرایەکی رووناککەر بکەوێتە پێش جەماوەرو ریگای زانینو تێگەیشتنی بۆ خۆشبکات. هۆیەکەشی ئەوەبوو کە ئەوکات هەم توانای مادی کەمبوو و هەم کادری پێشکەوتوو کە زمانی کوردی باش بنووسن و بخوێننەوە، نەبوون.

هەروەک پێشتر باسمان کرد، حکومەتی روسیا چاپخانەیەکی بۆ حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ناردو لە مەهاباد رۆژنامەی "کوردستان" دەردەکراو لە ناو کوردستانی ئێراندا بڵاودەکرایەوە. بە ژمارەیەکی کەمو کورت بۆ عیراقیش دەنێردراو ناوەرۆکی باش بوو. هەروەها گۆڤارەکانی "ئاگر"، "هەڵاڵە"و "هاوار" حەفتانە دەردەچوون. لە ناو رۆژنامەو گۆڤارەکاندا شتێکی وا نەدەنووسرا کە وا بنوێنێت حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بە بیروباوەڕی کومونیستیەوە هاتۆتە مەیدانی خەباتەوەو خەڵک وا تێبگات کە کوردستانی ئێران بەرەو یاسای سوسیالیستی دەروات. تەنیا هەر زۆر باسی "ستالین"و هێزی سوپای مەزنی روسیا دەکراو هەمشە لەلاپەڕەی یەکەمدا دەخرایە بەرچاو. هەواڵو دەنگوباسی ناوخۆو دەرەوە دەنووسرا لەگەڵ چەند لێکدانەوەیەکی سیاسیو هەروەها باڵاوکردنەوەی وتارەکان و هەلبەستەکان کە لە لایەن نوسەران و ئەدیبانەوە بۆ رۆژنامە و گۆڤارەکان دەنێردران. ئەو نووسەرانەی کەزۆر دەوریان هەبوو و پێشکەوتوو دیاربوون، هەژار، هێمن، عەبدوڕەحمان زەبیحیو قانع بوون. ئەم خوێندەوارانەی کە لە عیراقەوە هاتبوون، تەنیا هەر مامۆستا وردی بوو کە بە نووسەر ناوببرێتو زۆر شتی دەنووسی، بەڵام هەموویان بۆ بڵاونەدەکردە، چونکە زۆر رەخنەو رەخنەکاری لە نووسینەکانیدا هەبوو. هەروەها دڵشاد رەسولیش زۆر شتی دەنووسیو خۆی یاریدەری وەزیری رۆشەنبیری بوو. ناوبراو هەر لە منالیەوە لە شاری "کۆیە" خوێندبوویو زمانی کوردی بە نووسینو خوێندنەوە زۆر باش دەزانی.

هەموو چاپەمەنیەکان لەژێر چاودێری "مەنافی کریمی" وەزیری رۆشەنبیرییەوە بەڕێوە دەبران. لە هاوینی ساڵی ١٩٤٦دا "خەلیل خوسرەوی" دەستی بە رێکخستنو دامەزراندنی لاوانی کوردستان کرد. ناوبراو خۆی بیروڕای کۆمونیستی هەبوو و هەموو نووسراوەکانی پڕ لە باسو تاریخی کۆمونیستی بوونو ئەمەش لەگەڵ سیاسەتی حیزبی دیمکراتی کوردستان نەدەگونجا، بەڵام دیاربوو کە بەفەرمانی روسەکان ئەو کارەی پێسپێردراوە. خۆی زۆر برادەرایەتی لەگەڵ من هەبوو. داوای لێدەکردم کە لە کوردستانی عیراقیش رێکخراوی لاوان دروست بکەین.

هەر ئەو ساڵە (١٩٤٦) رێکخراوی ئافرەتانی کوردستانیش دامەزراو خێزانی قازی محەممەد بە لێپرسراوی "ئافرەتان"ی کوردستانی ئێران دانرا.

## دەربارەی بزوتنەوەی پەروەردەو فێرکردن

دەتوانم بڵێم بزوتنەوەی پەروەدەو فێرکردن زۆر کزو لاوازبوو. قوتابخانەکانی رەسمی جگە لە شاروشارۆچکەکان، لە ناو گوندەکاندا دەگمەن بوونو ئەوانەی هەشبوون هی زەمانی حکومەتی ئێران بوون کە هەر بە زمانی فارسی دەرسیان تێدا خوێندرابوو. تازە کۆماری مەهاباد خەریکی ئەوەبوو کە بەرنامە بۆ لەچاپدانی کتێبی کوردی بۆ قوتابخانەکانو گەشەپێدانی زانستو فێرکردنی کوردی لە کوردستانی ئێراندا دابنێن. ئەمەش زیاتر هۆی ئەوەبوو کە کۆمار تازە پێدەگەیشتو بە تەواوی نەکەوتبووە سەر کارە سەرەکیەکانیو توانای مادی ئەوەندە زۆر نەبوو کە بە هەموو شتێک رابگات.

هۆکاری سێیەمیش ئەوە بوو کە مامۆستایانی دەرسی کوردی زۆر بە کەمو کورتی هەبوون. چەند مامۆستایەکی کوردی عیراقی کە خۆیان بە هەستی کوردایەتیو نیشتمانپەروەریەوە وەکو "وردی" و "عوسمان دانش" و "کەریم زەندی"و چەند مامۆستایەکیتر کە ناویانم لەبیرکردووە، لە شارەکانی سلێمانی هاتبوون. ئەوانە خەریک بوون بۆ فێرکردنی مامۆستایانی کوردی ئێرانی دەوراتیان کردبوونەوە. لە کوردستانی ئێراندا زۆر کەم مامۆستا هەبوون کە لە

قوتابخانەکاندا وەکو پێویست دەرسی کوردی بڵێنەوە، وەزیری پەروەردە خۆی تازە خەریک بوو فێری نووسینو خوێندنەوەی زمانی کوردی دەبوو. قوتابخانەکانی ئاینی لە شارو گوندەکاندا زۆر هەبوونو بەرەو بزوتنەوەی زانستی ئاینی دەرۆیشتن. مەلای مزگەوتەکان لە کوردستانی ئێراندا بۆ راگەیاندنو شارەزا کردنی خەڵک بە سوودی کۆماری مەهاباد لە ناو جەماوەردا دەورێکی گرنگیان هەبوو. ئەمەش بە هۆی قازی محەممەدوە بوو کە خۆی زیاتر لەوەی سیاسی بێت، پیاوی ئاینی بوو. لەبەر ئەوە مەلایەکانی کوردستانی ئێران ئەم کۆمارەیان بەهی خۆیان دەزانی.

## شەڕی ناوچەی سەقز لە نێوان کوردو حکومەتی ئێراندا

ماوەیەک بوو کە سوپایەکی گەورەی حکومەتی ئێران لەناو شاری سەقزدا مۆڵگەی دانابوو. لەهاوینی ساڵی ١٩٤٦دا ویستی بۆ بەرزکردنەوەی ورەیو بە مەبەستی خۆپێشاندانو ترساندنی خەڵک خۆی تەکان بداتو بەرەو ناوچەی "بۆکان" دەربچێت. لەو کاتەشدا هێزێکی بارزانییەکان بە سەرکردانەتی "خەلیل خۆشەوی" لەسەر رێگای سەقز - بۆکان ئامادەو دامەزرابوونو پێشیان بەسوپای ئێران گرتو شەڕێکی زۆر گەرمو خوێناو لەمابەینیاندا رویداو لەم شەڕەدا ژمارەیەکی زۆر لەسوپای ئێران کوژرانو ژمارەی چل تا پەنجا ئەفسەرو سەرباز بەدیلگیران. لەئەنجامدا پاشماوەی سوپایەکە زۆر بەشەلو شکستی گەڕانەوە "مۆڵگە"ی خۆیان. لەو شەڕەدا "خەلیل خۆشەوی" لەگەڵ چەند ئەفسەری‌تری بارزانی شەهیدکرا. کاتێ هەواڵی ئەم شەڕە گەیشتە مەهابادو خەڵکی کوردستان دەنگی ئەم سەرکەوتنەیان بیست، یەکپارچە بوو بەزەمو شاییو هورەی خەڵک گەیشتە دوا پلەی بەرزی. بۆ رۆژی دووەم هەموو دەسکەوتەکانی ئەوشەرەیان لەگەڵ دیلە"کان هێنایایە شاری مەهابادو بۆ پێشاندانی خەڵک بەناو شاردا گێرایانن. لە پاش چەند رۆژێکی کەم هەموو "دیلە"کان بە ئەفسەرو سەربازەوە ناردرانەوە "تەورێز"و لەوێشەوە بۆ تاران رەوان کران. ئەمە کارێک بوو کە هەرگیز بە بیری خەڵکدا نەدەهات. ئەم

هەڵوێستەی کۆماری مەهاباد بوو بە جێگای پرسیارو سەرسوڕمانو دەیانگوت بۆچی ئەم هەموو دیلانە کە لە شەڕدا گیراون، بەبێ هیچ ڕێککەوتن یا وتووێژێک دەنێردرێنەوە تاران؟

وەرامی ئەو پرسیارانەی خەڵک ڕاستەوخۆ لەلایەن کاربەدەستانی کۆمارەوە نەدەدرایەوە، بەڵام ئەوەی کە هێندێ تێگەیشتنی سیاسی هەبوایە دەیزانی کە مەسەلەکە هەمووی تەوجیهاتی حکومەتی روسیایەو ئەم شلو توندکردنەشی هەرئەوان خۆیان دەزانن بۆچی دەیکەن. ئەمە هەمووی بۆ ڕازی کردنی حکومەتی ئێران بوو. هەمیشە سیاسەتی هەڕەشەو لاواندنەوەیان لەپێناوی وەرگرتنی نەوتی باکوور بەکاردەهێنا. ئێترهەرلە دوای ئەم شەڕەی سەقز حکومەتی روسیا هانی "جەعفەر پێشەوەری" سەرۆکی فیرقەی دیموکراتی ئازربایجانیدا کە بچێتە "تاران"و لەگەڵ حکومەتی مەرکەزیدا دەربارەی وەرگرتنی خودمختاری بۆ ناوچەی ئازربایجان بکەوێتە وتووێژ. جەعفەر پێشەوەری بە خۆیو وەفدێکی تایبەتی ڕۆیشتە "تاران"و لەگەڵ سەرۆک وەزیران "قەوامولسەڵتەنە" کەوتە وتووێژ کە ئەمەش لادان لەخاڵی ٥ی بڕیارنامەکەی مابەینی کۆماری مەهابادو فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان بوو. لەو خاڵەدا هەردولا بەڵێنیان دابوو کە بەبێ ڕازیبوونی هەردووتەرەف هیچجۆرە وتووێژێک لەگەڵ حکومەتی تاراندا نەکەن. لەدوای ئەمە زۆری پێنەچوو کە سوپای ئێران جارێکیتر بە فەرماندەیی "سپەهبود رەزم ئارا" کە ئەو کاتە رئیس ئەرکانی سوپای ئێران بوو بەرەو "بۆکان" هاتە پێشو لەگەڵ هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان تێکهەڵچوونو شەڕ دەستی پێکرد. ئەو جارە چەکداری عەشایری کوردستان بەتەواوی بەشداری شەڕیان کردو لەوشەڕەدا دەورێکی زۆر باڵایان هەبوو. زۆربەی زۆری ئەو عەشایرانە کە هەرچەند لەگەڵ شەڕەکانی نیزامی ئێستەدا نەدەگونجا، بەپێی دابو نەریتی کۆنی زەمانی عەشایری بەسواری ولاغ هاتبوون. بەهەرحاڵ زۆر مەردایەتیو فیداکاریان پێشانداو هەموو هێرشەکانی دوژمنیان یەک لە دوای یەک تێکدەشکاندو تۆزقاڵێک ماوەیان نەدا کە سوپای داگیرکەر سەرکەوتن وەدەست بهێنێت. جگە

لەوەش زۆر زەرەرو زیانی ماڵیو گیانیان پێگەیاندن. ئیتر با ئەم مەوزوعە لێرەدا بوەستێتو بزانین وتووێژی حکومەتی تارانو فیرقەی دیموکراتی تەورێز چی بەسەرهاتو ئەنجامەکەی چی لێهاتەوە. دووای چەندجار دانیشتنیان کە دوو حەفتەی خایاند، رێکەوتننامەیەکی چەند خاڵی لە مابەینیاندا مۆرکراو فیرقەی دیموکراتی تەورێز دانی بەوە داهێنا کە سوپای ئازەربایجان بەشێکە لە سوپای حکومەتی مەرکەزی تارانو لە خاڵێکیتری رێککەوتنەکەدا فیرقەی دێموکرات رازی بوو کە خەڵکی ئازەربایجان جگەلە وەرگرتنی خودمختاری بۆ خۆی داوایەکیتری نیەو هەرگیز نایەوێ لەحکومەتی مەرکەزی جیاببێتەوە. سەبارەت بە وەزعی کوردستانیش گوتبوویان کە خوێندن هەتا پۆلی ٥ی سەرتایی بەکوردی بێتو لەمە زیاتر مافیان نیە داوای هیچیتر بکەن.

نوێنەرانی ئازەربایجان گەرانەوەو ئەم هەواڵە لە رادیۆی تاران بەدرێژی بڵاو کرایەوە. ئینجا خەڵکی کوردستان بە تەواوی تێگەیشتنو بۆیان دەرکەوت کە ئەم دۆستانەی کۆماری مەهاباد کە تائێستە خۆیان زۆر بەدڵسۆزی کورد پیشاندابوو، هیچجۆرە دەروەستییەکی سیاسیان نیەو خەریکن چارەنووسی گەلی کورد لە پێناوی سوودی سیاسی خۆیاندا بخەنە بازاری کرینو فرۆشتن. ئیتر زۆری نەخایاند لە کاتێکدا کە هێزەکانی چەکداری کوردستان خەریکی پتەوکردنی بەرەی سەقزبوونو دەیانەویست هێرشێک بەرنە سەر سوپای "رەزم آرا" کە نوێنەرانی روسیا هاتنە مەهاباد. لەم کاتەدا نوێنەرانی روسیا رایانگەیاندو بەئاشکرا درکاندیان کە حکومەتی روسیا حەزناکات شەر لەناوچەکانی سەقزو ئەو ناوەدا زیاتر لەگەڵ سوپای ئێراندا درێژەبکێشێت. چونکە نفوزی بەریتانیاو ئەمریکا لە ناوچەکانی باشوری ئێراندا هەیەو مەترسی ئەوە دەکرێت کە ئەو دوو حکومەتانە بەهۆی بەرژەوەندی "نەوت" خۆ لە شەرەکە وەربدەنو کێشەکە زۆر گەورە بێت. هەروەها گوتیان حکومەتی روسیا ئامادە نییە لەو هەلومەرجەی ئێستادا خۆی تووشی ئەم جۆرە گیروگرفتانە بکاتو یارمەتی گەلی کورد بدات. ئینجا کاتێ ئەو راگەیاندنە ئاشکراو بێپێچوپەنایەی روسیا کە وەکو "ئینزاری خەتەر" وابوو، لە کوردستان

دەنگی دایەوە. مەسەلەکە یەکسەر بە بارێکیتردا گۆڕاو بۆشاییەکی گەورەشی لە ناو هەموو کاروباری کۆماری مەهاباد دروست کرد. واتە "هەموو ریسەکان بوونەوەخوری"و کۆماری کوردستان دەربارەی شەڕکردنو شەڕنەکردن کەوتە ئەمری واقیعو نەیدەزانی چی بکات باشە.

## کۆبونەوەی فراوان لەمەهابادو راوەستانی شەڕ

دوابەدوای ئینزارەکەی روسیا بە کۆماری مەهاباد سەبارەت شەڕوەستاندن، قازی محەممەد هەموو سەرۆک عەشایرەکانو پیاوە مەزنەکانی کوردستانی ئێرانی لەگەڵ ئەندامانی کۆمیتەی ناوندیو لێپرسراوانی سوپای کوردستانی بەئامادەبوونی مەلا مستەفا بارزانی کۆ کردەوە. لە کۆبوونەوەیەکی چەند سەعاتیدا لە سالۆنی حیزبو لەپاش وتوویژو هەڵسەنگاندنی مەسەلەکە لە هەموو روویەکی سیاسیو عەسکەرییەوە، رای زۆربەی زۆری خەڵک هاتە سەر ئەوە کە کۆماری کوردستانیش وەکو تورکەکانی تەوریز. لەگەڵ حکومەتی تاراندا بکەویتە وتوویژو بریاری شەڕراگرتن بدات. ئینجا قازی محەممەد بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ "رەزم ئارا" فەرماندەی سوپای ئێران پەیوەندی کرد. رەزم ئاراش داوای لە قازی محەممەد کرد بچێتە گوندی "سەرا" لە مابەینی بۆکانو سەقزو لەوێ چاویان بە یەکتر بکەوێت. قازی محەممەدیش بە خۆیو چەند کەسێک لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی رۆیشتنە گوندی "سەرا"و لەگەڵ رەزم ئارادا کەوتنە وتوویژ. ناوبراو پێش لە هەمووشتێک داوای لە قازی محەممەد کرد کە پێویستە بریاری شەڕراگرتن دەربکاتو هێزەکانی کۆماری مەهاباد لە هەموو بەرەکانی کوردستان بکشێنەوە دواوە. ئەوسا هەردوولا دابنیشنو باسی مافی کورد لە کوردستانی ئێراندا بکەن. ئیتر قازی محەممەد هیچ چارەی نەمابوو، دەەبوایە بە هەموو شتێک رازی بێتو داوایەکەی "رەزم ئارا" بەو هەموو گرانیو ناخۆشیەوە وەربگرێت. هەر لەوێوە بریاریدا هێزەکانی بارزانیو عەشایری لە ناوچەی سەقزو ئەو ناوە بکشێنەوە دواوە. بۆ بەرەی "سەردەشت"یش کە من خۆم لەو بەرەیە بوومو سوپای ئێران بۆ ماوەی چوار

مانگ کەوتبووە ژێر "ئابلۆقە"و لەوپەڕی بێئازوقەیی و تەنگاویدا دەژیا، مەنافی کەریمی وەزیری رەۆشنبیری لەلایەن قازی محەممەدەوە هاتە بەرەکەمانو بە زێرۆبەگی راگەیاند هێزەکانی خۆی بکێشێتەوە دواوەو رێگای مابەینی بانە و سەردەشت چۆڵ بکات تاکو ئازوقەو کەلوپەلی پێویست لە جادەوە بە سەیاراتی عەسکەری بگاتە سوپای "ئابلوقەدراوی" سەردەشت. زیرۆبەگ ئەم داوایەی زۆر لا ناخۆش بوو. حەزی دەکرد کە ئەم شەڕوەستانە هیچ نەبایە چەند رۆژێکیتریش دوا بکەوێت، تاکو سوپای سەردەشت بە هۆی نەمانی ئازوقە خۆی بە دەستەوە بدات. بەڵام چارەی نەبوو، دەبوایە فەرمانی پێشەوا قازی محەممەد تەنفیز بکات. پاشان مەنافی کەریمی خۆی رۆیشتە ناو سوپای ئێرانو لەوێ چاوی بە فەرماندەکان سەرتیپ "ئایروم" و سەرتیپ "پزشکیان" کەوت. پزشکیان ئەو ئەفسەرە بوو کە کاتی خۆی لەلایەن پشدەرییەکانەوە ئابلۆقە درابوو. ئەوجارەش بە هۆی شارەزایەتیو خەڵک ناسینیەوە بۆ مەبەستی راگەیاندن (تەبلیغات)و پەیوەندیکردن لەگەڵ دانیشتوانی ئەو ناوچەیە، هێنابوویانەوە بۆ سەردەشت. مەنافی کەریمی ئاگاداری فەرماندەکانی سوپای ئێرانی کرد کە رێگای سەیاراتی مابەینی سەردشتو بانە بۆ هێنانی ئازوقەو پێویستیەکانیان کراوەتەوە. بە مەرجێ لە خەتی جادە لانەدەنو بۆ ئەوەی لەگەڵ چەکداری عەشایر تووشی شەڕ و لێکدان نەبن، ماوە نەدرێ کە سەرباز بچێتە ناو گوندەکان. دوای ئەم راگەیاندنە مەنافی کەریمی گەڕایەوە بۆ مەهاباد.

## گەڕانەوەمان لەگەڵ زێرۆ بەگدا بۆ مەهاباد

لە کۆتایی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٦ بەرەی سەردەشت چۆڵکراو هەموو چەکدارەکانی عەشایریش ئاگادارکران کە بەشێوەی کاتی بگەڕێنەوەماڵەکانی خۆیان. زێرۆ بەگ چەند کەسێکی بەو مەبەستە هەڵبژارد لەگەڵیا بچین بۆ مەهاباد بۆ ئەوەی وەکو تەقدیر بۆ ئەو خزمەتەی کە خۆیو ئێمە لە ماوەی ئەو چەند مانگانەدا لە بەرەی سەردەشت کردومانە، پێشانی "پێشەوا"مان بدات. ناوی ئەوانەی کە لەگەڵ زێرۆ بەگدا رۆیشتین بریتی بوون لە:

١- برایم ئاغای بەریاجی، سەرۆک عەشیرەتی سویسنی ئێران
٢- حەمەی قادر ئاغا مەلکەڕی، سەرۆک عەشیرەتی سویسنی ئێران
٣- ئەحمەدی خدر ئاغا، گەورکی ئێرانو کەسایەتی ناسراو
٤- خدری خدران، گەورکی ئێرانو کەسایەتی ناسراو
٥- کوێخا برایمی بێوران مەلکەڕی، کەسایەتی ناسراو
٦- حەمەی هۆمەر ئاغا پشدەری ئێران، کەسایەتی ناودار
٧- سلێمانی رەشید ئاغا پشدەری ئێران، کەسایەتی ناودار
٨- مارف عەبدوڵلا ئاغا پشدەری ئێران
٩- برایم هەباس ئاغا، پشدەری عیراقی
١٠- کاکە ئەمەری میناغا، پشدەری عیراقی
١١- بابەکری حەمەی رەشید ئاغا، پشدەری عیراقی
١٢- میرزا حوسێن خەڕازی، خەڵکی شاری سەردشت
١٣- میرزا فەتاح غولامی خەڵکی سەردەشت

ئەمانە هەموومان کە نزیکەی شەست تا حەفتا کەس دەبووین، جگە لە سوارەکانی زێڕۆبەگ کە ئەوانیش ١٠٠ سوار دەبوون، کەوتینە رێگا. ئەو کاتە جادەی ئوتومبێلی مابەینی سەردەشت بۆ مەهاباد تێکچووبوو. هاتوچۆی خەڵک بە سواری وڵاخ بوو. ئێمە لە کاتی ئێوارە دەرچووین. چونکە هاوین بوو، دونیا زۆر گەرم بوو و بۆ بەرەبەیان گەیشتینە کوێستانی هاوینەهەواری "بەردووکە" کە دەکەوێتە ئەودیو چیای "زمزیران"و ماڵی کاکەڵای حەمەدئاغای گەورک لە گەڵ ٥٠ تا ٦٠ رەشماڵنشین لەوێ بوون. ئێمە چەند کەسێک لەو ئاغایانەی باسمان کردن، لە گەڵ زێڕۆبەگدا میوانی ماڵی کاکەڵا ئاغا بووینو چەکدارەکانی‌تریش هەموویان بەسەر ماڵاندا دابەش بوون. هەرچەند کاکەڵا ئاغا خۆی لەماڵەوە نەبوو، بەڵام ئاغاژن بەڕاستی ئاغاژن بوو. پڵاو و گۆشتێکی زۆری ئامادە کردو بەتەواوەتی پشوومان وەرگرت. چونکە رێگاکەمان زۆر دوور بوو، زوو کەوتینەوە رێگاو بە ماوەی شەوو رۆژێک بە بێ‌راوستان گەیشتینە گوندی "باتاس" لە نزیکی مەهابادو لەوێوە بە هۆی کۆمەڵی لە

ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیو پیاوە ناسراوەکانی مەهاباد کە بە ناوی پێشوازیەوە هاتبوون کەوا ئێمە پێشمەرگەی بەرەینو ماوەیەکی زۆرە لە پێناوی ئازادیی کوردستان ئەرکو ئازارمان کێشاوە، چەند ئۆتۆمبێلێکمان بۆهاتن. کاتێ گەیشتینە ناو شاری مەهاباد، دیتمان زۆر لە پیاوانو ئافرەتان بۆ دربڕینی هەستی نیشتمانپەروەریو بەخێر هێنانمان هاتوونەتە سەر شەقامو بانی خانوەکان. بۆ چەند سەعاتێک لە سالۆنی حیزب دابەزینو پاشان جێگاو رێگای حەسانەوەمان بۆ دابین کرا. ئەو کاتە پێشەوا لە مەهاباد نەبوو. بە رێکەوت چووبوو بۆ تەورێز بۆ ئەوەی لە گەڵ فیرقەی دیمکراتی ئازەربایجاندا وەفدێکی هاوبەش پێکبهێنن‌و بۆ وتوویژ لە گەڵ "قەواموسلەنتەنە" سەرۆک وەزیرانی ئێران پێکەوە بچن بۆ تاران.

ئێمە هەموومان لێپرسراوانی بەرەی سەردەشت رۆشتین بۆ گوندی "کووکێ" لە نیزیکی شاری رەزائیە. ماڵی زێرۆ بەگ لەو گوندە بوو. خۆی بانگهێشتنی کردبووین. ناوبراو دوو رۆژ میوانداری زۆر گەرمی لە ئێمە کردو هەر لەوکاتەدا ئاگادارکراین کە قازیمحەممەد لە تەورێزەوە بۆ کاری تایبەتی گەڕاوەتەوە رەزائیە. ئێمەش بە هەلمانزانی زیارەتی پێشەوا بکەینو هەر ئەو کاتە لە گەڵ زێرۆبەگدا چوینە رەزائیە. مابەینی گوندەکەی زێرۆبەگ لەگەڵ رەزائیە لە ۲۰ کیلومەتر زیاتر نەبوو، لەوێ چاومان بە "پێشەوا" کەوتو ماوەی دووسەعاتو نیو لە گەڵیدا دانیشتین. زێرۆبەگ هەموومانی یەک یەک بە قازی محەممەد ناساندو تاریفی لێ کردین. ئەویش زۆر سپاسی هەموو لایەکی کردو هاتە سەرباسی وتوویژ لەگەڵ حکومەتی تاراندا. گوتی ئێمە گەلی کوردی هەژار هەرگیز شەڕمان نەویستووەو هەمیشە لەلایەن داگیرکەرانەوە شەڕمان پێفرۆشراوە. ئیستەش کەوا حکومەتی تاران هاتۆتە سەرئەو رایە کە داواو کێشەکەمان بەشێوەیەکی ئاشتیخوازانە چارەسەر بکات، ئێمە نەک هەر رازین، بەڵکو زۆرسوپاسی لێدەکەین. هەروەها گوتی ئێمە لەگەڵ وەفدی "فیرقەی دیموکراتی ئازربایجان"دا دەچینە تارانو داوای ئێمە هەرتەنیا خودمختاری بۆ هەردوو نەتەوەی کوردو تورکە لە ئێراندا. ئەگەر حکومەتی مەرکەزی ئەم

مافەمان بۆ بسەلمێنێت، هەرچەند کەمیش بێت ئێمە رازی دەبین. چونکە بارودۆخی سیاسی ئێمە لەو هەلمەرجەی ئێستادا هەرئەوەندە یارمەتیمان دەدات. گوتی تورکەکانی تەورێز کە خۆیان زۆر لە ئێمە زیاتر سەیر دەکەن‌و هێزیشیان لە ئێمە گەلێک زیاترەو لەگەڵ ئەوەشا بارودۆخی سیاسی ناچاری کردوون لە پێش ئێمەدا لەگەڵ حکومەتی تاران بکەونە وتوویژو بەخودمختاری (حوکمی زاتی) رازی بن. ئەگەر بێتو ئێمەش وانەکەین‌و هەر رێگای شەڕبگرین، نەک هیچ کەس پشتیوانیمان لێناکات، بڵکو دۆستەکانیشمان لێدەبنە دوژمن. ئیتر لە قسەکانی قازی محەممەد زۆر باش دەرکەوت ئەم وتوویژە لە رووی ناچاریەوەو لە ژێر گوشاری حکومەتی روسیایە. قازی محەممەد خواحافیزی لەئێمە کردو لەگەڵ حاجی بابە شێخ "سەرەک وەزیرانی کۆمار" بەرەوە تاران کەوتنە رێگا. ئێمەش چەند شەوێک لە رەزائیە ماینەوەو لە پاشان گەراینەوە مەهاباد. رەزائیە شارێکی زۆرجوان‌و رازاوە بوو، ئێمە یەکەمجاربوو لەو شارە چاومان بە "سینەما " کەوت.

### وتوویژی نوێنەرانی کورد لەتاران

قازی محەممەد کە لەگەڵ نوینەرانی ئازربایجان‌دا رۆیشتە تاران. چەند جارێک لەگەڵ فیرقەی دیموکراتی ئازربایجان‌و یەکدوو جاریش بە جیاواز لە وەفدی تەورێز لە گەڵ قەوامولسەڵتەنە دانیشتن. پێشنیاری "قەوام" ئەوەبوو کەباکوورو باشووری کوردستان هەمووی بەیەکەوە بکرێتە یەک پارێزگاو قازی محەممەد بکرێتە "پارێزگار". بەڵام قازیمحەممەد ئەو پێشنیارەی قەوامولسەڵتەنەی رەدکردەوەو پێی رازی نەبوو. چونکە تێگەیشتبوو کە قەوام دەیەوێت تورکەکانی ئازەربانجان بکەونە دژایەتی کۆماری کوردستان‌و جیاوازی بخاتە نێوان کوردو تورکەوە. جگە لەوەش دەیزانی کە قەواموالسەڵتەنە هەر خۆی بریارەکە تێک دەداتەوە. پاش چەند رۆژ وتوویژ ئەم بریارانەی خوارەوە وەکو شتێکی کاتی دران.

١- قوامولسەڵتەنە بەڵێنی سەرزارەکی‌دا کە بە مافی خودمختاری بۆ هەردوو نەتەوەی کوردوتورک لە چوارچێوەی حکومەتی مەرکەزیدا رازیەو بڕیاریشی‌دا کە ئەم کێشەیە لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئێراندا باس بکرێتو ببێتە بڕیارێکی یاسایی.

٢- پەیوەندی‌و هاتوچۆ لەمابەینی هەردوو لا لەسەر ئاستی بەرز بە مەبەستی دانانی رێگا چارەی گونجاو دەربارەی خودموختاری‌و دیارکردنی سنووری "جوغرافی" بۆ هەردوو ناوچەکانی ئازەربایجان‌و کوردستان بەردەوام بێت.

٣- بڕیاردرا کە خەرج‌و سەرفیاتی کۆماری مەهابادو وتورکەکانی تەورێز بکەوێتە سەربودجە (میزانیە)ی حکومەتی مەرکەزی هەتا ئەو کاتەی کە هەردوولا دەگەنە ئەنجامێکی باش‌و کۆتایی بەکێشەکە دەهێنرێت.

بەم‌شێوەیە وتووێژ بە شکڵێکی کاتی تەواوبوو. قازی محەممەدو حاجی بابەشێخ گەڕانەوە بۆ مەهابادو هەر یەکیان ئوتۆمبێلێکی تازەشیان وەکو دیاری پێشکەش کرا. هەر بەهاتنەوەی ئەوان دەرکەوت کە ئەم وتووێژەی کە لە تاران کراوە، هەموو "فرت‌و فێڵە"و حکومەتی تاران دەیەوێت لە رێگای ئاشتیەوە کۆماری مەهاباد لەناوببات‌و قازی‌محەممەد خۆشی لە هەموو کەسێک باشتر ئەو راستیەی دەزانی، بەڵام چارەی نەبوو و نەدەکرا لە قسەی روسەکان سەرپێچی بکات‌و حەزیشی نەدەکرد ئاشکرا دان بەم راستیانە دابنێت. هەردوابەدوای هاتنەوەی قازی‌محەممەد لەتاران، هاتوچۆی نوێنەرانی حکومەتی ئێران بۆ مەهاباد دەستی پێکردو دەرگای برایەتی‌و دۆستایەتی ( لە رواڵەت‌دا) خرایە سەرپشت. خەرج‌و پێویستیەکانی کۆماری مەهاباد هەموو مانگ بەپێی بەندی ٣ی بڕیارنامەکەی وتووێژی تاران، لە پایتەختی ئێرانەوە دەهات.

حکومەتی روسیا هەرچەند نوێنەرانی دایمی خۆی لە رەزائیەو مەهاباد هەر مابوون، بەڵام وەکو جاران زۆر خۆیان تێکەڵاوی ئیش‌وکاری "کۆمار" نەدەکردو هەروەها بە نیسبەت "فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان"یش هەرهەمان هەڵوێستیان هەبوو. خۆیان دوورەپەرێز دەگرت، تاکو تێبگەن‌و بزانن داخوا قەوامولسەڵتەنە بە بەڵێبەکانی خۆی رەفتار دەکات یا نا؟ چونکە هەروەکو

باسمان کرد، ناوبراو بەڵێنی بە روسیادابوو لەکاتی کۆبونەوەی "پەرلەمان" کارێکی وابکات کە ئەو بڕیارنامەی "نەوت" بخرێتە دەنگدانو پەسەند بکرێت. لە هەمان کاتیشدا ئیجازەی حیزبی"تودە"ی ئێرانیاندا کە بە رەسمی کاری سیاسی خۆی بکاتو سێ ئەندامی ئەم حیزبەشی هێنایە ناو کابینە. مەبەستی قەوامولسەڵتەنە لەو کارانە ئەوەبوو کە حکومەتی روسیا بگاتە ئەوباوەڕە کە حکومەتی ئێران لە سەر ئەو بەڵێنانەی کە دەربارەی ئیمتیازی نەوتی باکوور داویەتی، زۆر راستو جدییەو بەتەواوی جێبەجێی دەکات.

## تەفرەخوادنی روسیا لە لایەن قوامولسەڵتەنە

هەرچەندە روسیا لە لایەن ئینگلیزو ئەمریکاوە سەبارەت بە دەست تێوەردان لە کاروباری ئازەربایجانو کوردستان کەوتبووە ژێر رەخنەو ناڕەزایی‌و هەروەها حکومەتی ئێرانیش هەمیشە بە رەسمی لە ئەنجومەنی نەتەوە یەکگرتوەکان شکایەتی دەکردو داوای دەکرد روسیا دەکرد هەرچی زووتر هێزەکانی لە ئازەربایجان بکێشێتەوە. بەڵام روسیا گوێی بۆ ئەم داوایەی ئێران شل نەدەکردو زۆر بە ساردیەوە وەری‌دەگرت. ئەوکاتە کۆنە سیاسەتمەداری ئێران قەوالولسەڵتەنە بەم بەڵێنیە بەتاڵو بوشانەی کەوا خستیە بەرچاوی روسیا، بەتەواوی گەیاندیە ئەو باوەڕەوە کە هەموو کارەکان بە سوودی ئێران کۆتایی پێ بێنێت. ئەمجارە حکومەتی ئێران زۆر ترسی لە کۆماری مەهابادو تورکەکانی تەورێز نەماو لە مانگی تەمووزی ١٩٤٦دا چەند نوێنەرێکی حکومەتی تاران بە سەرۆکایەتی سەرهەنگ "فیرووز" هاتنە مەهابادو راستەوخۆ بەقازی محەممەدیان راگەیاند چەک دانەنێن‌و حکومەتی ئێران ئامادە نییە خودمختاری بە کوردو تورک بدات. قازی‌محەممەدیش لەوەرامدا گوتی گەلی کورد کاتێ ئەو چەکەی هەڵگرتووە، کەس هانی‌نەداوە بۆ چەک هەڵگرتن، بەڵکو هەستی نەتەوایەتی خۆی پاڵی پێوەناوەو بە مەبەستی رزگاری نیشتمانەکەی دەستی داوەتە چەکو بۆیە من ناتوانم داوای چەک فڕێدانی لێبەکەم. نوێنەرەکانی ئێران گەڕانەوە تارانو بڕیاریش درا پەیوەندی

لەمابەینی "کۆمار"و تاراندا هەر بەردەوام بێت. زۆربەی زۆری خەڵک تێگەیشتبوون کە دوژمن نیازی زۆر خراپەو هەردەم چاوەڕوانی هەل دەکات بۆ ئەوەی چەپۆکی توندی خۆی بەسەر ئەو کۆمارە کۆپەریەدا بکێشێت. ئەوەی تاڕادەیەک خەڵکی ئومیدەوار کردبوو، قسەکانی قازیمحەممەد بوون کە هەمیشە دەیگوت ئێمە خودمختاریمان مسۆگەر کردووەو حکومەتی تاران بەڵێنی تەواویان بە ئێمەداوەو تازە ئەگەر خۆمان بەوە رازی بین، ئەوان لە بەڵێنو بڕیاری خۆیان پەشیوان نابنەوە. ئەگەر هاتوو پەشیوانیش بوونەوە، دۆستی مەزنمان حکومەتی روسیا هەر پشتیوانی ئێمەیەو وا بە ئاسانی لایەنی کورد بەرنادا.

قازیمحەممەد هەر تەئکیدی لەسەر ئەوە دەکرد کە هیچ شەڕو ئاژاوە لەناوچەکانی کوردستاندا لەمابەینی هێزی چەکداری کۆمارو سوپای ئێراندا دروست نەبێت، بۆ ئەوەی بۆ تێکدانی وتووێژ نەبێتە بیانوو بەدەستی حکومەتی ئێرانەوە. لەو ماوەیەشدا "سەدری قازی" برای قازیمحەممەد هەر لە هاتوچۆ دابوو. ناوەناوە پەیامەکانی "قەوامولسەڵتەنە"ی دەربارەی راستیو نییەتپاکی حکومەت بەرامبەر بە کێشەی کوردی ئێران بۆ قازیمحەممەد دەهێنا. "سەدری قازی" وەکو پێشتر باسمان کرد، لە "پەرلەمان"ی ئێراندا نوێنەری مەهاباد بوو. ناوبراو زۆر حەزی دەکرد کێشەی کورد لەڕێگای ئاشتییەوە جێبەجێ بکرێتو بەوپەڕی دڵپاکیەوە خەریکی نێوبژیوانی بوو.

### رۆیشتنی خوێندکارانی کورد بۆ باکۆ

لەبیرمان چوو پێشتر باسی ئەوە بکەین کە حکومەتی روسیا لە بەهاری ساڵی ١٩٤٦ دا داوای لە قازیمحەممەد کردبوو پێش ئەمەی کە وتووێژ لەمابەینی کۆماری مەهابادو تاراندا دەست پێبکات، کۆمەڵێک لە لاوانی کورد لە تەمەنی ١٨ ساڵ تا٢٢ ساڵ و پلەی خوێندەواریشیان لە پۆلی شەشی سەرەتایی کەمتر نەبێت، ئامادەبن بۆ ئەوەی بۆماوەی دووساڵ بخرێنەبەر دەورەی "ئاکادیمی" سیاسیو عەسکەریو بچنە "باکۆ". قازیمحەممەدیش ئەو

کارەی زۆرپێ باش بوو. هەرچی زووتر وەجبەی یەکەمی ڕەوانکرد کە بریتی بوو لە ڕەحیمی قازی، مستەفا شلماشی، حوسین حیسامی، سەید عەزیز شەمزینی کوڕی حاجی سید عبداللە ئەفەندی و چەند کەسێکی‌ترکە ناویانم بیرکردوە. ئەم وەجبەیە زۆر کەم بوون‌و بڕیاردرا کە وەجبەی دووەم زۆرتر بن‌و هەر بەدوای ئەواندا ڕەوانە بکرێن. وتوویژ بەسەرداهات‌و تا گەیشتە مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٤٦ کارەکە وەستانی تێکەوت. بەهەرحاڵ بڕیاری کۆمارو بەتایبەتی قازی‌محەممەد خۆی سەبارەت ناردنی وەجبەی دووەم هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهات. چونکە نەحکومەتی ڕوسیاو نەحکومەتی ئێران هیچ کۆسپێکیان نەخستە سەر ڕێگای تێکدانەوەی ئەم بڕیارەو هەردوولایان بە ناردنی وەجبەی دووەم‌و سێیەمێش ڕازی بوون. تەنانەت حکومەتی ئێران پێشنیاری کرد ئەو خوێندکارانە هەتا بە تەواوی فێری زمانی ڕوسی دەبن، بۆ ماوەی چەند مانگێک لە تەورێز بمێننەوە، بەڵام قازی‌محەممەد ئەم پێشنیارەی پەسند نەکردو وای پێ‌باش بوو کە هەر یەکسەر لەتەورێزەوە بچنە باکۆ .

ئەوەبوو قازی‌محەممەد کەوتە ناو عەشایرەکان‌و زۆر هەوڵی لەگەڵ سەرۆکەکانیاندا کوڕەکانی خۆیان بۆ ئەم سەفەرە بنێرن. بەڵام عەشایرەکان هیچ‌کامیان ئامادەنەبوون کوڕەکانیان بەدیتنی وڵاتانی دەرەوەو ڕاهاتنیان لە گەڵ هەڵسوکەوتی گەلانی بێگانەدا ببن بە هۆی گۆڕینی یاسای دەرەبەگایەتی‌و چەوساندنەوەی خەڵکی هەژار. بەڕاستی ئەمە یەکێک لەدووربینیەکانی قازی‌محەممەد بوو. بەهەرحاڵ پەنجا تا شێست کەسێک لە خەڵکی شارەکانی مەهابادو بۆکان‌و میاندواو و زۆربەیان لە ئاغایەکانی فەیزوڵلابەگی خزمی خۆمان بوون بۆ ئەم سەفەرە ئامادەکران.

## بڕیارم بۆ بەشداربوون لە سەفەری باکۆ

من تا ئەوکاتەی کەوا وەجبەی دووەم لەخوێندکاران ناویان تۆمارکرا بۆ سەفەری باکۆ، هەر لە مەهاباد مابووم‌و لەوانەی کە ناویان تۆمار کردبوو، چەند برادەرێکم دەناسی. هاتنە لام و زۆر هانیاندام کە لەم سەفەرەدا

لەگەڵیاندا بەشدار بم. منیش بە باشم زانی بە حوکمی ناسین‌و ئیخلاسیم سەبارەت بە قازی‌محەممەد، رۆیشتمە لای‌و داوام لێ‌کرد ناوی منیش لە لیستی خوێندکاران تۆمار بکرێت. ئەویش زۆر بەمیهرەبانیەوە گوتی هەرچەندە تۆ عیراقیت بەڵام ئاگاداری مەنافی کەریمی دەکەم "جنسیەو شەهادە"ی ئێرانی قوتابخانەت بەناوی مەهاباد بداتێ‌و بەناوی قوتابی کوردی ئێرانی ناوت تۆماربکات. بەهەرحاڵ بە ماوەی دوو رۆژ هەموو معاملاتی پێویستیم بۆ جێبەجێ کرا. ئەو کاتە تەمەنم لە ٢١تا ٢٢ساڵی بوو . ئیتر بڕیاردرا کە لە سێیەم رۆژی جەژنی رەمەزاندا وەجبەی دووەمی خوێندکاران بۆ تەورێزو لەوێشەوە یەکسەر بۆ باکۆ بەرێ بکرێن. دواکەوتنی سەفەرەکەمان بۆ جەژنی رەمەزان هۆی ئەوەبوو کە زۆربەی قوتابیەکان بە رۆژو بوون‌و مانگی رەمەزانیش ئەوەندە نەمابوو تەواو بێت. کاتێ باوکم لە پشدەرەوە ئەم هەواڵەی پێگەیشت، لەوێوە بە هەڵەداوان شەوی کردبوو بە رۆژو بە سواری ولاغ هات‌و خۆی گەیاندە مەهابادو بە پرسیاران منی دۆزیەوە. باوکم گوتی هاتووم لەم سەفەرە پەشیوانت بکەمەوە. ئەگەر بە قسەشم نەکەی خۆم دەکوژم. منیش زۆر تکام لێ‌کرد کە وازم لێ‌بهێنێت تاکو ئەم هەلەم لە کیس نەچێت. ئەو هەر لە سەر داوای خۆی سوربوو. منیش لە سەر رای خۆم سوربووم. لە ئەنجامدا رۆیشتەلای قازی‌محەممەدو منیشیان داوا کرد. ئەویش فەرمووی باوکت داوای لەمن ئەوەیە کە معامەلاتی سەفەرەکەت تێک‌بدەمەوە. ئێستا بزانم خۆت دەڵێی چی؟ منیش گوتم گەورەم تۆ خۆت پێشەوای مەزنی ئێمەی‌و هەمیشە هانی خوێندکارانی کورد دەدەی کە بچنە دەرەوە. بخوێنن‌و هەروەها لوتفیشتان لە گەڵ منا کردوە کە وەکو کوردێکی ئێرانی معامەلاتی سەفەرم بۆ بکرێت. ئێستە چۆن لە لوتفی خۆت پەشیوان دەبیتەوە ؟ من داوام لە جەنابتە کە بەڵکو باوکم رازی بکەی وازم لێ بهێنێت. ئەویش روی کردە باوکم‌و گوتی جەنابی ئەحمەد ئاغا تکام وایە بەرگری لە عەبدوڵلا بۆ ئەم سەفەرە نەکەی. چونکە خێری گشتی تێدایەو خۆشی زۆر حەز دەکات. باوکم بە نابەدڵی هەڵساو رۆیشتە لای حاجی بابەشێخ سەرۆک وەزیران‌و لەوێوە داوا کرام. حاجی بابە شێخ گوتی عەبدوڵلا

بۆ چی بە قسەی باوکت ناکەی؟ ئایا نازنی ئەگەر کوڕ بە گوێی باوکی خۆی نەکات خواوەند رزگاری ناکات؟ منش گوتم جەنابی شێخ، زۆرلام سەیرە کە جەنابت وا دەفەرموی. من وامدەزانی تۆ خۆت باوکم رازی دەکەی کەوازم لێ بهێنێت تا بچم بۆ خوێندن کە ئەمەش کارێکی خێرەو خێری گەلی کوردی تێدایەو رەسوڵی خوا فەرموویەتی "اطلبوا العلم ولو بالصين" ئەویش گوتی نازانی کە لە روسیا یاسای کومونیستی‌یەو هەموو ئیلحاد و کوفرە. گوتم قوربان من بۆ خوێندن دەچمو هیچ ئیشم بە کومونیستی نییە. ئەویش رووی‌کردە باوکمو گوتی وازی لێ‌بهێنەو ئەمانەی تازە پێ‌دەگەن بە قسەی منو تۆ ناکەن‌و منیش کوڕێکم هەیە هەرهەمان بڕیاری داوەو دەشزانم کە لەوێ "کافر" دەبێت. ئیتر لەلای حاجی بابەشێخ هەستاین‌و گەڕاینەوە قۆناغەکەی خۆمان. لەوێ چەند خزمێکی پشدەری کە ئەوانیش هاتبوونە مەهاباد، سەریان لە ئێمەداو هەموویان لەگەڵ باوکمدا کەوتنە داواو رەجا کە پەشیوانم بکەنەوە. لەوانە سلێمانی رەشید ئاغاو مارفی عەولا ئاغا بوون کە زۆر کێشەیان دەکرد تا ئەوەبوو هەموویان بە یەکەوە دەستیان کرد بە گریان‌و ناچاریان کردم کە بکەومە ژێر تەئسیری "عاتیفە"و بڕیاری سەفەرەکەم تێکبدەمەوە. رەفیقەکانم هەموویان بۆ رۆژی دووەم تەورێزو لەوێشەوە بۆ باکۆ رەوانە کران. بەڵام ئەو وەجبەیە پاش ئەوەی کۆماری مەهاباد تێکچوو و حکومەتی تاران هاتەوە کوردستان، زۆربەی زۆریان گەڕانەوە بۆ ئێران‌و وازیان لە خوێندنی روسیا هێنا.

## هەڵوێستی سەرۆک عەشیرەتەکان

ئەو سەرۆک عەشیرەتانەی کوردستانی ئێران کە هەر لە یەکەم رۆژەوە هاتبوونە ناو ریزی حیزب‌و لەگەڵ کۆماری مەهابادا هاوکاری‌یان دەکرد، کاتێ دیتیان‌و بۆیان روون‌بۆوە حکومەتی روسیا پشتی کردۆتە کێشەی کوردو خەریکی رازی‌کردنی حکومەتی تارانە، تارادەیەک کەوتنە حاڵەتی نائومێدی‌و هیوایان بە کۆماری مەهاباد زۆر کەم بۆوە. زۆربەیان بە شێوەی نهێنی لەگەڵ

حکومەتی تاراندا کەوتنە پەیوەندیکردن. بە تایبەتی عەولای بایزئاغای سەرۆک عەشیرەتی مەنگورو عەزیزی قەرەنیئاغای مامەش کە ئەو کاتە قەرەنی ئاغا خۆی کۆچی دوایی کردبوو. هەروەها قاسمی حاجی بایز ئاغای دیمزکریو حەمەرەشید خانی بانە کە ئەو بەلای خۆیەوە روتبەی ژنراڵیشی پێدرابوو. ئەمانە هەموویان لە ژێرەوە لەگەڵ حکومەتی تاران کەوتنە پەیوەندیکردن. عومەرخانی شکاکیش لە ناوچەی رەزائیە کە زۆر دەستەڵاتدارو خاوەننفووز بوو، بە جیاواز پەیوەندی لەگەڵ کۆنسوڵی ئەمریکا لە تەورێز کرد و پێی گوتبوون کە بەڵکو ئەمریکا دەستی یارمەتی بۆ کورد درێژ بکات. لە سەر ئەو پەیوەندیەی عومەرخان نوێنەرێکی ئەمریکایی هاتە مەهابادو چەند دانیشتنێکی لەگەڵ قازیمحەممەد کردو پێیگوتبوو کە باشترین رێگا بۆ ئێوە ئەوەیە کە لەگەڵ حکومەتی تاران رێکبکەونو بە قسەی کەس تەفرە نەخۆن. هەر لەو کاتەدا کە عەشایرەکان کەوتنە دوودڵیو دەستیان کرد بە پەیوەندیکردن. ئەفسەرێکی تایبەتی بە ناوی سەرتیپ هومایون بە مەبەستی لاواندنەوەو راکێشانی سەرۆک عەشایرەکان لە تارانەوە ناردرایە کوردستان. چونکە حکومەتی تاران ئەو راستیەی باش دەزانی کە بڕبڕەی پشتی کۆماری مەهاباد هەر ئەو عەشایرانەنو ئەگەر ئەوانە پشتی کۆماری کوردستان چۆڵبکەن، جگە لە بارزانیەکان چەکداری وابەهێز نامێنێت کە پارێزگاری لە کۆماری کوردستان بکات. ئیتر بەو نیازەوە سەرتیپی ناوبراو هاتە کوردستانو لە شاری "سەقز" نیشتەجێ بوو. پارەو پوڵێکی باشی بڵاو کردەوەو بە ماوەیەکی زۆرکەم کۆمەڵێ دۆستو لایەنگیری پەیدا کردنو ئەو دوو سەرۆک عەشیرەتانەی باسمانکردن - عەولای بایز ئاغای مەنگورو عەزیزی قەرەنی ئاغای مامەش- خۆیان ئاشکرا کردو لە دژایەتی کۆماری کوردستان کەوتنە بانگەشەو قسەی خراپ. کۆماریش چەکداری کۆکردەوە کە لێیانبدات، ئەوان بەرەو خاکی عیراق رایانکردو پەنایان بۆ عەشیرەتی پشدەر هێنا. ئەو کاتە عەشیرەتی پشدەر لە ناوچەی خۆیدا دەستەڵاتی زۆری هەبوو. چونکە حکومەتی عیراقیش زۆر لاواز ببوو، بەرگریان لە ئێرانیو غەیری ئێرانی نەدەکرد بێتە ناو خاکی عیراقەوە.

لەلایەکیتریشەوە حەمەرەشیدخانی بانە کە خۆی ژنراڵ بوو، بەشێک بوو لە لەشکری کوردستانو ئەویش لەسەر ڕێگای خۆیدا "حەمەد ئاغا"ی "سەرا"ی تالان کردو گەڕایەوە ناوچەی خۆی گوندەکانی "وێنە" و "دارۆخان" لە پێنجوێن. حەمەدئاغای سەرا پیاوێکی زۆر دەوڵەمەندو سەر بە حکومەتی ئێران بوو. مەبەستی حەمەرەشیدخان لەو تالانکردنەدا ئەوە نەبوو کە حەمەد ئاغا سەر بە حکومەتی ئێرانە، بۆیە تالانی دەکات، بەڵکو هەر ئەوەبوو کە حەمەرەشیدخان زۆر حەزی لە پارەو ماڵو پاتاڵ دەکرد، ویستی کە لەو ڕۆیشتنەدا دەسکەوتێکی باش بۆ خۆی وەربگرێت. جگە لەو تالانەش، زۆر چەکو فیشەکو کەلوپەلی کۆماری مەهابادی لەگەڵ خۆیدا برد. ڕۆیشتنی حەمەرەشیدخان هیچ پەیوەندی بە سیاسەتی ئێرانەوە نەبوو، چونکە ناوبراو هەمیشە دژی حکومەتی ئێران بوو و ئێرانیەکان بە دوژمنی راستەقینەی خۆیان دەزانی. بەڵام ئینگلیزەکان خۆیان بە جیاواز پەیوندییان پێوەکردو بۆ سوودی سیاسی خۆیان تەفرەیانداو لە کۆماری مەهابادیان دوورخستەوە.

هەرچەندە ئەم عەشیرەتانەی باسمانکردن دژی کۆمار هەستانو زۆریتریش لە ژێرەوە هەر خەریکی پەیوەندی لەگەڵ حکومەتی ئێران بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا خەڵکێکی زۆر لە عەشایرو غەیری عەشایر مابوون کە لایەنگرییان لە کۆماری کوردستان لە مەهاباد دەکردو لەسەر قسەو بەڵێنی خۆیان بوون. هەر لەو ماوەیەشدا سەرکۆمار قازیمحەممەد خۆی بە ڕاگەیاندنو هوشیار کردنەوەی خەڵکی کوردستانەوە خەریک کردبوو. تێیدەگەیاندن دۆستە مەزنەکەی ئێمەو هاوپەیمانەکانمان هەر لەگەڵماندانو هەرگیز پشتی ئێمە بەرنادەنو خودموختاریش بۆ کوردی ئێران مسۆگەرە. قازیمحەممەد دەیزانی خەڵک نائومێد بوونەو دەیویست بەو ڕاگەیاندنانە ورەی خەڵک بەرز بکاتەوە. تا ڕادەیەکیش خۆی هەر لەو باوەڕەدابوو کە حکومەتی روسیا لە گەڵ قەوامولسەنتەنەدا ناگاتە هیچ ئەنجامێکو ناچار دەبێت جارێکیتر چاو بەسەر هەڵوێستی بەهەڵەچووی خۆیدا بخشێنێتەوەو بە تەواوی بەلای کۆماری مەهاباددا بگەڕێتەوە.

## هەڵوێستی بارزانیەکان لە رووی سیاسیو عەسکەرییەوە

بارزانیەکان بە سەرۆکایەتیی شێخ ئەحمەد براگەورەی مەلامستەفا خاوەنی ٢ تا ٣ هەزار چەکداری فیداکارو تاقیکراوە بوونو خۆیان لە خاکی ئێراندا بە میوان سەیر دەکردو بۆیان نەدەکرا ئەوانیش وەک عەشایرەکانیتری ئێرانی بکەونە پەیوەندیکردن دەگەڵ ئێرانو تەنیا ئومێدو هیوایەکی هەیانبوو، کۆماری مەهاباد بوو. لەبەرئەوە بریاری نیهاییان هاتبووە سەر ئەوە کە پارێزگاریی تەواو لە کۆمار بکەنو هەتا دوا هەناسەیان پشتی بەرنەدەن. قازی محەممەدیش خۆی ئەو راستیەی دەزانیو تاکە ئومێدی بە بارزانیەکان بوو. کاتێ مەلا مستەفا وەزعە ئاڵۆزو داپۆشراوە سیاسیەکەی کوردستانی ئێرانی هاتە بەرچاو، چونکە زۆر باوەرو متمانەی بە حیزبی دیموکراتی کوردستان نەمابوو کە وەک حیزبێکی پێشرەوی سیاسی دەوری شۆرشگێریی خۆی بگێرێت، زۆر بە پێویستی زانی کە ئەویش هەوڵی ئەوە بدات حیزبێکی سیاسیی کوردی لە کوردستانی عێراق بە مەبەستی دوارۆژ دروست بکات. بەو مەبەستە، هەمزە عەبدوڵلا گەنجێکی حقوقی - کە ئەویش لە مەهابادبوو و بە ناوی بەشدار بوون لە بزوتنەوەی کوردی ئێران لە عێراقەوە هاتبوو- مەلا مستەفا داوای لێکرد بچێتەوە عێراقو بۆ پێکهێنانی حیزبێکی سیاسی کوردی لە کوردستانی عێراق هەوڵ بدات. بارزانی چەند نامەیەکی بۆ پیاوە ناسراو و نیشتمانپەروەرەکانی کوردستان پێدا نارد بۆ ئەوەی هاوکاری تەواو لە گەڵ هەمزە عەبدوڵلا بکەن. ناوبراو هاتەوە کوردستانی عێراقو بە ناوی مەلا مستەفاوە کەوتە هاتوچۆ بۆ ناوچەکانی کوردستان. زۆر لە پیاوانی سیاسیو نیشتمانپەروەرانی کوردی چاو پێکەوتو توانیان لە ١٦ی ئابی ساڵی ١٩٤٦ دا حیزبێکی سیاسی بە ناوی "پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق" پێک بهێننو ئەندامانی لیژنەی مەرکەزی دیاری بکەنو بازێک لەو ئەندامانە هەر لەوێوە مەلا مستەفا دیاری کردبوون، بخرێنە ناو کۆمیتەی ناوندیەوە".

ناوی ئەندامانی یەکەم کۆمیتەی مەرکەزی پارتی دیموکراتی کوردستان:

١- مەلامستەفا بارزانی، سەرۆک
٢- هەمزە عەبدوڵڵا، سکرتێری پارتی
٣- کاکە زیاد حەمەئاغا، جێگری دووەمی سەرۆک
٤- شێخ لەتیف شیخ مەحموود، جێگری یەکەمی سەرۆک
٥- ساڵح یووسفی، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی
٦- جەعفەر عەبدولکەریم، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی
٧- عەلای عەبدوڵڵا، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی
٨- تەها محیەدین، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی
٩- میرحاج ئەحمەد، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی
١٠- عەبدولکەریم تۆفیق، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی
١١- رەشید عەبدولقادر، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی
١٢- رەشید باجەلان، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی
١٣- عەونی یووسف، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی
١٤- مستەفا خۆشناو، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی

هەمزە عەبدوڵلا لیستەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی بۆ مەلامستەفا هێنایەوە مەهابادو حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیش ئەم کارەی زۆر پێباشبوو. پێکهێنانی ئەم حیزبە تازەیان لە کوردستانی عێراقدا بە هیوایەکی دوارۆژی خۆیان دەزانی. ئیمکانیەتی پارتی لە کوردستانی عێراقدا لە هەموو روویەکی سیاسیو کۆمەڵایەتییەوە زۆر کزو لاواز بوو و نەیدەتوانی وەک پێویست لە ناو کۆمەڵانی خەڵکی کوردستاندا جێگای خۆی بکاتەوەو بۆ ماوەی چەند ساڵ خەباتی نەهێنی دەکردو نەیدەتوانی ژمارەی ئەندامانی زیاد بکات.

## گەڕانەوەم بۆ عێراق لەسەر ئیزنی قازی محەممەد

پاش ئەوەی سەفەری روسیام تێکدایەوەو دیتم کە دەرگای بەرەکان (جبهەکان)ی شەڕ داخراوەو من ئیشێکم نیە کەوا پێویستی مانەوەم بکات لەمەهاباد، هەستامو رویشتمە لای قازی محەممەدو عەرزم کرد کە ئیستا هێمنیو ئاسایش لە کوردستان بەردەوامەو جگەلە دانیشتن کارێکم نیە، حەز دەکەم روخسەتم بدەی کە بگەڕێمەوە کوردستانی عیراق. ئەویش فەرمووی بەمەرجێ کە لە کاتی پێویستدا بگەڕەیتەوە لامان. گوتم من هەمیشە ئامادەمو هەرکاتێ پێویستی کرد دەگەڕێمەوە بەرەی خۆمان، بەرەی سەردەشتو یاهەر شوێنیتر کە جەنابتان بۆم دیاربکەن. ئیتر خواحافیزیم لێ خواستو یەکەیەکە سەرم لە برادەرانو لێپرسراوانی کۆمارداو بۆ رۆژی دووەم بەناوی خوواحافیزی چومەلای حەمەحوسێنخان وەزیری بەرگریو ئەویش گوتی دیاریەکی جەنابی پێشەوا کە ئێستە گەیەشتۆتە لای منو بۆتۆی ناردوە، لەگەڵ ئەم نووسراوەی خۆم کە بەبۆنەی دیارییەکەوە بەنیشانەی ئەو رێزو تەقەدیرەی جەنابی پێشەوا بۆتان قایلەو لێتان رازیە، پێشکەشتان دەکەم. دیاریەکە بریتی بوو لە دوو قات قوماشی خوری "ئەفسەریی خاکی". منیش هەستام بە سوپاسێکی زۆرەوە بۆ هەردوکیان قازیمحەممەدو محەممەد حوسێنخان، دیارییەکەو نووسراوەکەم لێ وەرگرت. ئێستاش ئەو نووسراوەم وەکوو دەقی خۆی هەموو ئەو چەند ساڵە دوورو درێژانە پاراستووەو بۆ یادگار دەیخەمە ناو یادداشتەکانمەوە. ئەم دیارییەی پێشوا هەرچەند کە بەنرخو کێشان زۆر کەمو سووک بوو، بەڵام لە رووی مەعنەویەوە زۆر بەنرخو گران بوو. ئەمجۆرە دیاریانە کە لەلایەن پیاوە گەورەکانەوە بە خەڵات دەدرانە خەڵک، واتای ئەوە بوو کە خەڵات کراو وەزنێکی سیاسی یا عەسکەریو یا کۆمەڵایەتی هەیە. لەلایەن پیاوی گەورەوە دەخوێندرێتەوەو بە چاوی رێزلێگرتنەوە سەیری دەکرێت. پاش ئەوەی کە سەردانی دۆستو برادەرانم تەواو کرد، مەهابادی ئازاد کراوم بەجێ هێشتو بەرەو سەردەشت کەوتمەڕێگاو لە کۆتایی مانگی ئابی ساڵی ١٩٤٦ گەیشتمەوە ماڵەوە. تا ئەو کاتەش ماڵەکەمان لە

هاوینەهەواری بازاڕ هەر مابووو زۆربەی ئاغایەکانماڵەکانیان ماڵەکانیان بۆ خوارەوە نەڕۆیشتبوونەوە. تا چەند رۆژ هاتنی خزمو دۆستان هەر بەردەوام بوو. وایان دەزانی لە سەفەری حەج هاتوومەتەوە. ئیتر دوای ماوەیەک ماڵەکەمان رۆیشتەوە گوندی بێتاسە لە گەرمیانو کەوتمەوە ناو ئیشو کاری کەسابەتو کشتو کاڵو ئاژەڵ بەخێو کردن. هیچ ئاگام لە وەزعی کۆماری مەهاباد نەما. راستی ئەو زەمان "رادیۆ"و شت نەبوو کە خەڵک دەنگوباسی هەندەران وەربگرێت. رۆژنامەی کوردستانیش کە لە مەهاباد بۆ کوردستانی عێراق دەنێردرا، نەدەگەیشتە دەستی هەموو کەس. بەڵام مەحموود ئاغای هێرۆ کە تاکە کەس بوو رادیۆی بە باتری تەڕی هەبوو، دەبوایە بە پشتی وڵاغ بچێتە قەڵادزێو باتریەکە پڕ ( شەحن) بکرێتەوە. ئەمەش چەند رۆژی دەخایاند. مەحموود ئاغای هێرۆ هەر جارەو ناوە ناوە بە نووسراو لە دەنگوباسەکانی جیهان ئاگاداری دەکردم.

من هەر ئەو کاتەی گەڕامەوە ماڵەوە، ئەگەر ئیشو کارەکانم تەواو دەبوون، خۆم بە فێربوونی زمانی رووسی خەریک دەکرد. هەر لە مەهاباد کاتێ کە خەریک بووم بچم بۆ "باکۆ"، کتێبێکی تەرجەمەی روسیو فارسیم پەیدا کردو لە گەڵیا خەریک بووم. کاتێ گەڕاشمەوە کوردستانی عێراق، ئەو کتێبەم لەگەڵ خۆمدا هێنا، چونکە نیازی ئەو سەفەرەم هەر لە دڵا مابوو و دەمویست بە هۆی ئەم کتێبەوە هیچ نەبێ کەمێ فێری زمانی روسی بم و وام دەزانی کۆماری مەهاباد هەر دەمێنێتو وا بە ئاسانی لەناو ناچێتو منیش هەر دەبێ بۆ خوێندن بچم بۆ روسیا. ئەم مەبەستە هەمیشە لە مێشکمدا دەهاتو دەچوو. هەر لە بەر ئەوە بوو کە شەوو رۆژ خەریکی نووسینو خوێندنەوەی دەرسەکانی کتێبەکەم بووم. بەڵام بە داخەوە ئاواتەکەی من نەهاتە جێو تەمەنی کۆماری مەهاباد زۆر کورت بوو. رێکەوتی زەمان وابوو کە من پاش دەیان‌ساڵ واتە لە ساڵی ١٩٧٢ چوومە روسیاو زۆر لە دەرسەکانو ئەو زاراوانەی کە لە کتێبەکەوە فێریان ببووم، هاتنەوە بیرمو توانیم لە ماوەی سێ مانگو نیو مانەوەم لە روسیا، تارادەیەک لە قسەکردن لە گەڵ خەڵکی روسیادا

کەڵک لە بەرهەمی ئەم خوێندنەوەیە وەربگرم. لێرەدا نامەوێ بکەومە ناو باسی ئەو سەفەرەی روسیا، چونکە لە باسەکانی خۆمان جیاوازە کە باسی کۆماری مەهابادە. ئەگەر لە داهاتوودا خوا یارمەتی دام، لە یادداشتەکانیتردا بە درێژی باسی لێدەکەین. ئێستە هەر ئەوەندە دەخەمە بەرچاوی خوێنەری خۆشەویست کە بزانێت هۆی ئەم سەفەرەم چی بوو. لە ساڵی ١٩٧٢دا کە لە لایەن کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی روسیاوە بڕیاردرا چەند هەڤاڵێکی بارزانی نەم بە مەبەستی "حەسانەوەو رابواردن" بۆ روسیا بنێرن، بۆ ئەم وڵاتە ناردراینو زۆربەی شارە گرنگەکانی روسیاو هاوینەهەوارەکانی جۆرجیاو سەر دەریای رەشمان دیتن. راستی زۆر رێزیان لێگرتینو من لە هەموویان درەنگتر گەڕامەوەو تەنیا مانگونیوێک لە هاوینە هەوارەکانی جۆرجیا جگە لە مۆسکۆو شارەکانیتر مامەوە. واتە هەمووی سێ مانگو نیو مامەوەو گەشتێکی زۆر خۆش بوو.

## دەست پێکردنەوەی شەڕ لە نێوان کۆماری مەهابادو حکومەتی تاران

حکومەتی تاران لە ماوەی راوەستانی شەڕو دەستپێکردنی وتووێژ زۆر هەنگاوی سیاسیو عەسکەری هاویشتنو چەند کارێکی وای کردن کە ببێتە هۆی بەهێزبوونی خۆیو لاواز بوونی کۆماری مەهاباد کە بریتی بوون لە:

١- پەیوەندی کردن لە گەڵ زۆربەی عەشایرەکانی ئێرانو راکێشانیان بۆ لای خۆی.

٢- ئامادەکردنی سوپایەکی گەورە بۆلێدانی هەردوو کۆمارەکانی کوردو ئازەربایجان لە مەهابادو تەورێز.

٣- رازیکردنی حکومەتی روسیا بەهەموو فڕوفێڵێک کە واز لە ناوچەکانی ئازەربایجان بهێنێتو رێگا بەسوپای ئێران نەگرێت، ئەگەر ویستی بێتە پێشەوە بۆ داگیرکردنەوەی ئازەربایجانو کوردستان.

٤- چەسپاندنی قسەی خۆی لەئەنجومەنی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئەوەی ماوە نەدەن روسیا بە هیچجۆرێک دەست بخاتە ناو ئیشوکاری ئێرانەوە.

حکومەتی روسیا کە لەلایەک "بەڵین"ی لە قەوامولسەلتەنە سەرۆک وەزیرانی ئێران وەرگرتبوو کە لەدوای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی "شورا" بڕیارەکەی نەوتی بۆ مۆر بکاتو لە لایەکیتریشەوە گوشاری خستبووە سەر ئینگلیزو ئەمریکا بۆ ترساندنی روسیا کە ئەگەر لە ئێران نەچێتە دەرەوە، شەڕی جیانیی سێهەم هەڵدایسێت. ئەوە بوو روسیا هاتە سەر ئەم بڕیارە کە خاکی ئێران بەتەواوی چۆڵبکات. ئەنجامەکەی بوو بەبڵاوکراوەیەک بە زمانی فارسی وەک خواحافیزی کە ناوەرۆکەکەی بەم شێوەی خوارەوە بوو:

"برایانی بەڕێزی خەڵکی ئازەربایجان بە تورکو کوردو هەموو کەمایەتیەکانیەوە!

خۆتان دەزانن کە حکومەتی روسیای مەزن لە سەرتاسەری جیهاندا هەمیشە پاڵپشتی هەموو نەتەوەیەکی هەژارو بەشخوراو بووە. ئێمە کە هاتینە ئازەربایجان هیچجۆرە درێغییەکمان بۆ یارمەتیدانی کۆمەڵانی خەڵکی بە شەرەفی ئازەربایجان چی لە رووی سیاسیو چی ئابووریو کۆمەڵایەتیەوە نەکرد. ئیستاش لەکاتێکدا کە بەرژەوەندیو سودی گشتی حکومەتی روسیاو ئێران وا دەخوازێت کە ئێمە خاکی ئازەربایجان چۆڵ بکەین، بڕیارماندا کە هەموو نوێنەرانی سیاسیو عەسکەریی خۆمان بکێشینەوە دواوەو بگەڕێینەوە خاکی خۆمانو بە پێویستمان زانی بەهۆی ئەم بڵاوکراوەیەوە ماڵئاواییتان لێبکەینو ئومێدەوارین هەمیشە یەکگرتوو و سەرکەوتوو بن."

ئەوە بوو کورتەی بڵاوکراوەکەی روسیا. پاش ئەوەی حکومەتی روسیا خاکی ئازەربایجانی بەجێهێشت، حکومەتی تاران کەوتەخۆیو فەرمانی بەسوپای ئامادەکراو دا کە بەرەو کوردستانو تەورێز بچنە پێشەوە. یەکەمجار لە ناوچەکانی سەقزو بۆکان دەستیان کرد بە جموجۆڵو هاتنە پێشەوەو بڕیارنامەی شەڕوەستاندنیان خستە ژێرپێ. لە خەتی "بانە"شەوە بەرەو سەردەشت هاتن. لە گوندی "بناویلە" کە دەکەوێتە مابەینی "بانە"و "سەردەشت"، بە سەرکردایەتی حەمەی مەولوود سەرلقێکی سەربازیی کۆماری مەهاباد کە لەو ریگایەدا واجبی پێ سپێردرابوو، پێش بە سوپای ئێران گیرا و بەتوندی لە

سوپای ئێرانیان داو زیانێکی زۆریان پێ گەیاندو نەیانهێشت بگاتە سەردەشت. هەروەها بارزانیەکانیش لە سەر رێگای سەقزو بۆکان لەگەڵ سوپای ئێراندا کەوتنە شەڕو ئاگری شەڕ لە هەموو لایەکەوە هەڵگیرسایەوەو بە تەواوی دەرگای وتوویژ داخرا.

ئینجا من وەکو لەپێشەوە باسم کرد، هەر لەماڵەوە خەریکی ئیشوکاربووم‌و هیچ ئاگام لەم روداو و گۆڕانکاریە نەبوو. تاکاتێ لەمانگی تەشرینی دوەمی ساڵی ١٩٤٦ دا نووسراوێکی مەحموودئاغای هیرۆم بۆهات‌و ئاگاداری کردم کەشەڕ لەبەرەی سەردەشت دەستی پێکردۆتەوەو بەکرعەبدولکەریم مەشهوور بە رەئیس‌بەکر لە مەهابادەوە بۆ فەرماندەی بەرەی سەردەشت ناردراوە. منیش هەرهەمان کات هەستام بۆ ئەوەی بەتەواوی لەچۆنیەتی ئەم هەواڵە تێبگەم، نووسراوێکم بۆ رەئیس بەکر نارد. ئەویش هەرهەمان رۆژ وەرامی نامەکەمی دایەوە و داوای لێکردبووم کە زۆر بەپەلە بگەمەوە بەرەی سەردەشت، چونکە ئەویش دەیزانی سەربەکۆماری مهابادم‌و پێشتریش لەم بەرەیە ئیشم کردووە. ئیتر هەستام‌و لەگەڵ چەند خزمێکی خۆم وەکو مستەفای مارف‌ئاغاو بابەکری سوفی هەباس‌و چەند چەکدارێک بەهەموو کەلوپەل‌و پێداویستی وەکو پێخەف‌و خواردەمەنیەوە کەوتینە رێگاو بۆرۆژی دووەم گەیەشتینە گوندی "میرشێخ حەیدەر" کە دەکەوێتە رۆژئاوای سەردەشت‌و بەپێوانەی ٤ لیکۆمەتر لە سوپای ئێرانەوە دووربوو. بەکرئاغا هەر لە نووسراوەکەی خۆیدا ئەو جێگایەی بۆ دیاری‌کردین، چونکە شوێنێکی ئیستیراتیژی بوو. هەر بەگەیەشتنمان خەڵکی‌تریش لە چەکدارانی ئەو ناوچەیە زۆر پویوەندیان پێوە کردین‌و ژمارەی چەکدارەکانمان زیاتربوو. ئێمە بارەگای خۆمان لە گوندەی میرشێخ حەیدەر داناو خەتی بەرەی پێشەوەشمان لە"گردی غەوزە" بەرامبەری سوپای ئێران دامەزراندو عەشایری "مەرەسەنە"ش بەچەکداری خۆیانەوە بۆ فراوان کردنی "بەرەکە" زۆر هاوکاریان لە گەڵاکردین‌و لەدواییدا ئاگاداری بەکر ئاغامان کرد کە ئازوقەو جبەخانەی تەوامان بۆ بنێرێت. بەکر ئاغا خۆی لە بارەگای دوواوە لە گوندی "هەمران"ی ناوچەی "رەبەت" بوو.

شەڕ لە هەموو بەرەکانی سەردەشت رۆژ بە رۆژ دەهاتو گەرمتر دەبوو. لە چوار لاوە ئاڵقەی ئابلوقە لە سوپای دوژمن تەنگ دەکەرایەوە. هێزەکانی ئێران بە تۆپو دەبابە پارێزگاری خۆیان دەکردو توانای دەرچونیان لە سەربازگە نەبوو. ئێمە کەرەستەی بەرگری کردنمان لە دەباباتی دوژمن تەنیا ئەو "شووشە تیزابانە" بوون کە پێشتر باسمان کرد کە لە روسیاوە بۆ مەهاباد ناردرابوون‌و لەمە زیاتر شتێکمان نەبوو کەهێرش بەرینە سەر دەبابەکان‌و لە دوورەوە بیانشکێنین. بەڵام نەوەندە چەکەش هەرباش بوو. دەبابەکانی دوژمن زۆر لێی دەترسان‌و نەیاندەتوانی بێنە پێشەوە.

دووای چەند شەوو رۆژ شەڕو لێکدان، بەکر ئاغا خۆشی هاتبوە بەرەکەمان‌و لە ئیشو کاری "بەرە"و رێکخستنمان زۆر رازی بوو، چونکە بەرەی ئێمە کلیلی دەرگای سەکەوتن بوو و هەموو گروگەرمای ئاگری شەرکەوتبووە سەرئەو بەرەیە، لەسەر داوای ئێمە حمەی مولوودیش لە ناوچەی رەبەتەوە بەخۆی‌و لقێکی سەربازیەوە گوازرایەوە لای ئێمە. من هەر ئەو کاتەی گەیەشتمەوە بەرەی سەردەشت، نووسراوێکی تایبەتیم لە رێگای "پۆستەچی" دایمی مابەینی سەردەشت‌و مەهابادەوە بۆ قازی محەممەد ناردو لە نامەکەدا بەپێی ئەو بەڵێنەی کاتی گەڕانەوەم بۆ پشدەر دابووم، لە هاتنەوەم بۆ بەرەی سەردەشت ئاگارارم کرد. ئەویش هەر هەمان کات وەرامی نامەکەی دابووە، بەڵام پێم نەگەیشتبوو. چونکە وام زانی کەوا نووسراوی یەکەمی پێ‌نەگەیشتووە، ناچار بووم نووسراوی دووەمی بۆ رەوانە بکەم. ئەویش لە وەرامی نووسراوی دوەمدا بە چەند کورتە دێرێک نووسیبوی نووسراوەی یەکەمم وەرام داوەتەوە. نووسراوەی دوەمی قازی کە هەر لام ماوە، لەگەڵ نامەی وەزیری بەرگری ژنراڵ محەممەد حسین‌خان ناسراو بە سەیفی‌قازی وەکو یادگاری دەیخەمە ناو یادداشەکەمەوە. ئینجا بابگەرێنەوە سەرباسەکەمان ئەو باسەی کە لەپێشمانەو بە دەسمانەوەیە تەواوی بکەین.

ئەوەبوو کۆماری مەهاباد زۆر پەلەی دەکرد لە داگیرکردنی ئەو سوپایەی کە لەسەردەشت ئابلوقەدارابوو و هەمیشە بە نامەو راسپاردە دەیانناردە سەر

بەکرئاغا کە لە گرتنی سەردەشتو داگیرکردنی ئەو سوپایە پەلە بکات. بۆ ئەو مەبەستەش زێرۆبەگیان بەخۆیو لەشکرێکی زۆرەوە لە جیاتی بەکرئاغا بۆ فەرماندەی ئەو بەرەیە نارد. هۆیەکەشی ئەوەبوو، وایان دەزانی زێرۆبەگ زیاتر شارەزایی لەو بەرەیەدا هەیەو خەڵکی ناوچەکەش باشتر دەیناسن. هەروەها مەلا مستەفاشیان بەهێزێکی زۆری بارزانیەوە ناردە بەرەی "سەقز". هەر ئەو دووبەرەیەش بوون کە ئەوکاتە لە کوردستاندا زۆر ئیستیراتیژیو سەرەکی بن. ئیترکاتێ دەنگی هاتنی زێرۆبەگ گەیشتە ناوچەی سەردەشت، خەڵک هاتنە سەر ئەوباوەرە کە سوپای دوژمن لەوبەرەیە لە دوو ڕۆژیتر زیاتر خۆی ناگرێتو داگیردەکرێت. چونکە ناوبراو چەکدارێکی زۆری لە عەشایری هەرکیو شکاک لەگەڵدابوو، خۆشی بە فەرمانەیەکی زۆر شەڕکەرو لێزان دەناسرا. شەڕولێکدان کەوتە ئەو پەڕی گەرمیو هەموو کاتێک چاوەڕوانی خۆ بەدەستەوەدانی ئەو سوپایەدەکراو وای لێهاتبوو کە زۆربەی زۆری "ڕەبایە"کانی دەوروبەری سەربازگەی تیپ چۆڵ کرابوونو کشابوونەوە ناوسەربازگەی ناوشارو ئێمە چەند ئێسترو کەلوپولمان لە ڕەبیایەکی(پاسگایەکی) نیزیکی خۆمان دەست کەوتبوو. بەڵام کێ دەزانێ داخوا چەرخی ڕۆژگار چۆن دەسوڕێتو لەسوودی کێ کاردەکاتو دەوری خولانەوەی خۆی بەنەمانی کام دەستەو تاقم تەواو دەکات؟ ئەوەبوو ئێمەی کلۆڵ هیچ ئاگاداری دەنگوباسی دونیا نەبوینو نەماندەزانی داخوا وەزعی ڕوسو ئێران چی بەسەرهاتوەو هەروەها نەماندەزانی ئەو سوپایەی ئێران کەبەرەو ئازەربایجانو تەوریز دەرچوبوو، گەیشتوتە کوێ؟ چونکە هەروەکو پێشتر باسم کرد، ئەوکاتە لە هەموو ناوچەی سەردەشتدا تاکە ڕادیۆیەک نەبوو کە مرۆڤ دەنگوباسی جیهانی پێوەربگرێتو پۆستەی مەهابادیش بە ١٥ ڕۆژ جارێک دەهاتە سەردەشت و دەگەیشتە بەرەی ئێمە.

ئینجا مەحموودئاغای هێرو کە خۆشی چل تا پەنجا چەکداری لەبەرەی ئێمەداهەبوو، نووسراوێکی تایبەتی بۆ ناردمو تێیادا ئاگاداری کردم کە سوپای ئێران بەپێی ڕادیۆی تاران گەیشتونەتە تەوریزو جەعفەر پیشەوەریو

لێپرسراوانی "فیرقەی دیموکراتی تەورێز" رایانکردوە بۆ روسیا. کاتێ ئەو هەواڵەم لای مەحموود ئاغاوە بۆ هات، وام زانی کە ئەمە بانگاشەی حکومەتی ئێرانەو بۆ بەرزکردنەوەی ورەی سوپای خۆیان بە کاری دەهێنن‌و لە رادیو بڵاوی دەکەنەوە، چونکە هیچ بەبیری مرۆڤدا نەدەهات کە حکومەتی تەورێز بەم هەموو چەک‌و تەقەمەنیە پێشکەوتوویەوە کە تۆپ‌و بازوکەشیان بەشێوەیەکی تایبەتی‌و جیاواز لە کۆماری مەهاباد لە روسیا وەرگرتبوو، چۆن وا بە ئاسانی دەڕووخێت‌و سوپای ئێران دەگاتە تەورێز؟ ئەوەبوو منیش هەر هەمان کات ئەم هەواڵەم بەپەلە بۆ زێرۆبەگ نارد. ئەویش تازە لە مەهابادەوە بەسواری وڵاغ گەیەشتبۆوەو ئاگاداری هیچ لەم روداوانە نەبوو.

## رووخانی هەردوو کۆماری مەهابادو تەورێز

سوپای ئێران کە لەتارانەوە بۆ داگیرکردنەوەی ئازەربایجان دەرچووبوو، هەرلە شاری "تاکستان" کە دەکەوێتە ٢٥٠ کیلومەتری تاران چەکدارەکانی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان پێشیان پێگرت‌و توشی شەڕبوو. بەڵام ئەوەندەی نەخایاند چەکدارانی ئازەربایجان رایانکردو هەتا تەورێز خۆیان نەگرتەوە. لەدەوری تەورێز هێندێ شەڕی بەربڵاو کراو سوپای ئێران توانی لە رۆژی ١٣ مانگی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦دا شاری تەورێز داگیربکات‌و حکومەتی دروست کراوی کۆمۆنیستی لەناوبەرێت. ئەم هەواڵە ناخۆشە بۆ رۆژی ١٤ی مانگی کانون گەیەشتە مەهابادو پشێوی‌و ئالۆزی کەوتە ناو شارو ئەندامانی حیزب‌و لێپرسراوانی کۆمار بۆ پرس‌و راوێژ بەتێکڕایی روویان کردە ماڵی قازی محەممەد. لەو کاتەدا مەلامستەفا وەکو پێشتر باسمان کرد لە بەرەی سەقز بوو. ئەویش وەک ئێمە کە لە بەرەی سەردەشت بووین، ئاگاداری ئەو رووداوانە نەبوو. هۆیەکەشی ئەوەبوو کە لەبەرەی سەقزو بۆکان هیچ پێشرەوییەک لەلایەن سوپای ئێرانەوە رووی‌نەدابوو. ئەندامانی حیزبی کە رۆیشتنە ماڵی قازی‌محەممەد، هاتنە سەر ئەو باوەڕە کە لە توانیاندا نییە شەڕو بەرگری بکەن. ئەگەر حکومەتی تەورێز بەم هەموو توانایەی خۆیەوە

نەیدەتوانی یەکرۆژ شەر بکات، چۆن کۆماری مەهاباد توانای بەرگری‌و بەرەنگاربوونەوەی سوپای ئێرانی هەیە. لەوکاتەدا هیچ پشتیوانیکیشی نەبوو. ئەندامان داوایان لەقازی‌محەممەد کرد هەموویان لە شاری مەهاباد بچنە دەرەوەو بۆ عیراق یان بۆ روسیا برۆن. بەڵام قازی محەممەد بەو پێشنیارەی ئەوان رازی نەبوو و گوتی ئەگەر من لە شاری مەهاباد دەربچم، حکومەتی ئێران هەموو رق‌و توورەیی خۆی بە خەڵکی هەزاری شارەکە دەرێژێت‌و بەیەکجاری شارەکە کاول‌و وێران دەکات. بەڵام ئەگەر لێرە بمێنمەوە، هەموو لێپرسراوەتی‌و تاوانێک دەخەمە سەر شانی خۆم‌و حکومەت واز لە خەڵک دەهێنێت. ئەوکاتە هەرچی بیانەوێ بیکەن لە گەڵ شەخسی مندا دەیکەن. ئیتر هەرچی هەوڵیاندا قازی لە مەهاباد دەربچێت، سوودی نەبوو. ئەو لەبریاری خۆی دانەبەزی. قازی تا رادەیەک بروای وا بوو برایەکەی(سەدری قازی) کە ئەندامی "پەرلەمانی" ئێران بوو و لەنێوان قازی‌و قەوامولسەڵتەنەدا خەریکی نێوبژیوانی بوو، هەرنەبێ دەتوانێت لە مەترسی گرتن‌و ئێعدام رزگاری بکات. بەڵام بەداخەوە قازی‌محەممەد بە هەڵەچووبوو، نەیدەزانی خۆشی‌و برایەکەشی ئیعدام دەکرێن. لەم‌ناوەدا، ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی‌و زۆربەی لێپرسراوانی کۆمار ناچاربوون لەگەڵ قازی‌محەممەد بمێنەوە. بریاریشان دا بەیانێک دەربکەن‌و خۆشیان بەرەو پیری سوپای ئێران بچن.

قازی‌محەممەد خۆی کلێشەی بەیاننامەکانی چۆڵ کردنی بەرەکانی نووسی‌و بە چاپ کراوی بڵاوکرانەوە. کاتێ مەلا مستەفا ئەم هەواڵە ناخۆش‌و دڵتەزێنەی پێگەیشت، لەو ترسە کە سوپای ئێران رێگای گرتبێ، نەیدەتوانی بە ئۆتۆمبێل لە جادەی بۆکان‌و سەقزەوە بگەرێتەوە مەهاباد، ناچار بوو لە چیاکانی مابەینی مەهابادو بۆکاندا قەدبڕ لێبدات‌و لە ١٦ی مانگدا خۆی گەیاندەوە شاری مەهابادی پڕ لەتەم‌و ماتەم‌و یەکسەر رۆیشتە ماڵی قازی‌محەممەدو داوای لێکرد ئاڵای کوردستان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرن‌و بەیەکەوە برۆنە دەرەوە. بەڵام وەرامی قازی‌محەممەد هەر ئەوەبوو کە پێشتر گوتبووی. مەلامستەفا بە خۆی‌و هەموو بارزانیەکانەوە هەرچی چەک‌و تەقەمەنی کە لەناو عەمبارەکانی مەهاباد

هەبوو، لەگەڵ خۆیان بردیانو شاری مەهابادیان بەجێ هێشتو بەرەو ناوچەکانی"نەغەدە" و "شنۆ" کەوتنە رێ.

شاری مەهاباد ئەو رۆژە زۆر کەوتبوە ناو پەشێویو هەوری رەشی غەم و پەژارە بەتەواوی ئەم شارە جوانەی داپۆشیبوو. لەناو هەموو ماڵو خێزانێکدا گریانو شیوەن دەست پێکرابوو. خەڵک لەماڵەکانی خۆیاندا خەریکی شاردنەوەو فرێدانی چەکو تەقەمەنیو نووسراوەکانی زمانی کوردیو پارچە پارچەکردنی وێنەی ستالین بوون. هیچ ماڵێک نەبوو لە مەهاباد کە چەند وێنەی ستالینی هەڵنەواسیبێت. خەڵک دەیانزانی سەربازو جەندەرمە دڕندەکانی ئێران دەکەونە پشکنینی هەموو ماڵێک دەبوو لە رۆژی ١٧ی مانگی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦دا سوپای ئێران بە فەرماندەیی "ژەنڕاڵ هوومایوونی" لە رێگای بۆکانەوە بەرەو مەهاباد هاتە پێشەوەو قازیمحەممەدو حاجیبابەشێخو کۆمەڵێکی زۆریش لە لێپرسراوانی کۆمارو پیاوماقوڵانی شاری مەهاباد بەرەو پیری سوپای ئێرانەوە چوونو هوومایوونی بەگەرمی بەخێرهاتنی کردن. هەرئەو رۆژە سوپای ئێران گەیشتە ناو شاری مەهابادو قازیمحەممەد لە ماڵەکەی خۆیدا خرایە ژێر چاوەدێری.

### بەرەی سەردەشت

ئێمەلەبەرەی سەردەشت هیچ ئاگاداریمان لەوەزعی مەهاباد نەبوو. نەماندەزانی داخوا سوپای ئێران لەتەورێزەوە بەرەو کوردستان هاتووە یان ناو هەر خەریکی شەڕو پەلاماردانی دوژمن بوین. بەتایبەتی رۆژی ١٧ی مانگ وەکو لە بیرمە، زۆر سەرکەوتنمان وەدەست هێنابوونو زۆر خۆمان لە سەربازگەی سوپا نیزیک کردبۆوە. هەر بۆ شەوی داهاتوو واتە شەوی ١٨/١٧ کانونی یەکەم لەکاتێکدا کە بەو هەموو سەرکەوتنەوە زۆر دڵخۆشبووین، من خۆم زۆر ماندوو بوومو دووشەو بوو نەخەتبوومو چەند خزمێکیشم لە گەڵ چەند چەکدار بۆ بەشداری لە بەرگری لە ئالانەوە هاتبوون، گەڕامەوە بارەگا. ئەو میوانانەم چاوەڕوان بوون کەوا خۆم بەیانی لەبەرەی شەڕ شوێنێکیان بۆ

دەستنیشان بکەین. سەعات ١٢ی نیوەشەو خەوتمو لەسەعات یەکی پاش نیوەشەودا یەکێک بە دەنگێکی بزڕکاو بانگی کردمو گوتی کاک عەبدوڵلا هەستە خەبەرێکی زۆر ناخۆشم هێناوە، "یاخوا ملم بشکێت". منیش هەڵسامو گوتم چیە، چی قەوماوە؟ دیتم "سەیدحەسەن" خەڵکی مەهابادە کەناسیاوی خۆمان بوو. دەگریاو لە رێگاوە بەپەلە هاتبوو. گوتی قوڕکراوە بە سەرماندا و پشتی هەموومان شکا. کۆماری کوردستان رووخا. منیش واقمووڕ ماو نەمتوانی قسەبکەم. هەرچی بیرم کردەوە بزانم خەونە یا راستی، بۆم ساغ نەدەبۆوە. چونکە سەیدحەسەن خۆی هێندێ درۆو شتی هەبوون لەوانەشە گاڵتەمان پێبکات. ناوبراو جانتەکەی خۆی راکێشاو چەند بەیانێکی لەو بەیانانەی کە قازیمحەممەد مۆری کردبوون، هێنایە دەرەوەو دایەدەستم. کاتێ خوێندمەوە، هەستم کرد کەوا گرانایی‌و قورسایی ئەم شاخو کێوانەی کوردستان کەوتۆتە سەرشانم. راستی بۆماوەی چەنددەقیقەیەک لەبەرگریان نەمدەتوانی قسەبکەم. لە دواییدا ناردم بەشوێن حەمەی مەولوودا کە ئەویش بەرێکەوت ئەوشەوە هاتبووە بارەگای خۆی‌و بەیاننامەکەم دایەدەستی. کاتێ خوێندیەوە، هەرشێت بوو. خەریک بوو لە هۆش خۆی بچێت. دوای ماوەیەک گریان گوتی تکام وایە چەند چەکدارێکی خۆتانم لە گەڵدا بنێرە هەتا دەگەمە گوندی "هەمران" لای زێرۆبەگ. چونکە دەترسم عەشایر لەم سەر رێگایانە بۆ خاتری چەکەکانمان شەڕمان پێبفرۆشن. ئەگەر گەیەشتمە لای زێرۆبەگ، هەرچەند ناشزانین داخوا وەزعی مەهاباد چۆنەو سوپای ئێران گەیەشتۆتە ئەوێ یان نا، لەوێوە هەموومان بەیەکەوە روو دەکەینەوە لای مەهاباد. چونکە سەید حەسەن رۆژی ١٦ لەمەهابادەوە دەرچوبوو و ئەو رۆژە سوپای ئێران نەگەیەشتبووە مەهاباد، ئێمە خەبەری گیرانەوەی مەهابادمان نەبوو. ئیتر من سێ چوار چەکدارم لەگەڵ حەمەی مولوددا رەوان کرد. چونکە هەموو ناوچەکە منی دەناسی، کەس نەیدەوێرا بیر لە رووتکردنی ناوبراو بکاتەوە. بەڵام ناوبراو لە "هەمران" فریای زێرۆبەگ نەکەوتبوو، چونکە ئەویش وەکو ئێمە بەیاننامەکانی پێگەیشتبوو و ئاگادار کرابوو. لە ترسی عەشایەری گەورکو مەنگوڕ بەپەلە بۆ لای مەهاباد

دەرچوبوو. پاشان زانیمان کە زێرۆبەگو حەمەی مولوودیش هەردوکیان تووشی هێندێ پیاو خراپو ڕێگر هاتبوون، بەلام خوارزگاری کردبووونو بەسەلامەتی گەیەشتبوونە دەوروبەری مەهابادو چەند ڕۆژان لە گوندەکانی نزیک مەهاباد مابوونەوە. بەیاننامەی قازیمحەممەد بریتی بوو لەو چەند دێرانەی خوارەوە:

"برایانی بەڕێز...

**وێرای ریزو سلاو، ئاگادارتان دەکەم کە سوپای ئێران گەیەشتە تەوریزو حکومەتی "جەعفەر پێشەوەری" بەبێ ئەوەی هیچ بەرگری لە خۆی بکات روخا. بۆیە ئێمە لە پاش هەڵسەنگاندنو لێکدانەوەیەکی زۆر لەهەموو روویەکی سیاسیو عەسکەریەوە، بڕیارماندا بەرەکانی شەڕمان چۆڵ بکەینو بۆ بەخێرهێنانیان بەرەوپیری سوپای ئێران بچین. تکام وایە کە ئەوانەی عیراقین بگەڕێنەوە عیراقو ئەوانەی ئێرانیش لە نیزیکترین شوێنی سوپای ئێران خۆیان بەدەستەوە بدەن .**

**براتان محەممەد قازی**"

## دەرچونمان لە گوندی میرشێخ حەیدەر بەرەو سنووری عیراق

هەر ئەوشەوەی کە بەیاننامەکان هاتن، خەبەرمان وەرگرت کە سوپای ئێران لە سەربازگەی سەردەشتەوە بەرەو میرشێخ حەیدرو ئەو ناوە دێتە پێشەوە. خەڵکی ناوچەکەو ئەو چەکدارانەی کە ئێرانی بوون، زۆر تەنگاو ببوونو نەیاندەزانی چیبکەن. ئەگەر متمانەیان هەبویایە کە لەعیراق جێگایان دەبێتەوە، هەموویان رایان دەکرد. بەهەرحاڵ ناچار بوون خۆیان ەدەستەوە بدەنو پەنا بەرنە لای حەسەن ئاغای "بیزیلە"و مامەندی حاجی هەباس ئاغا، چونکە ئەو دوو کەسانە وەک باسمان کرد چەکیان بۆ حکومەتی ئێران هەڵگرتبوو.

ئێمە هەر ئەوشەوە لە "میرشێخ حەیدەر" دەرچووینو بۆ بەیانی هاتینە گوندی بێورانو لەوێوە بۆ سەرسنووری عیراق. من نەمتوانی یەکسەر بچمەوە گوندەکەی خۆمان. لەوێوە نووسراوێکم بۆ مەحموود ئاغای هێرۆ نارد تاکو بزانم بۆ گەڕانەوەم بۆ ماڵی خۆم چی دەڵێت. ئەویش لە وەڵامدا گوتبووی هەرچەند کە زۆرکەس راپۆرتووشیان لەدژی تۆ بۆ میری نووسیوە، بەڵام دەچمە قەڵادزێ بەڵکو لای قایمقام ئیشەکە جێبەجێ بکەمو نووسیبووی حکومەتی عیراق پاش رووخانی کۆماری مەهاباد "گووتی" بەرز بۆتەوەو تاقیبی ئەو کەسانە دەکا کە بەناوی بەشداربوون لە کۆماردا چونەتە ئێران. ئەوەبوو مەحموودئاغا رۆیشتە قەڵادزێو لەگەڵ قایمقام عەبدورەحمان شەرەف بەفەرشێکی "وەرتە"ی ئێرانی رێککەوتبوو. بەو مەرجەی کەهەموو راپۆرتەکان ببەستێتو مەسەلەکە بخاتە ئەو قاڵبەوە کەمن بە ئیشوکاری کشتوکاڵ چووم نەک سیاسەت. دیارە ئێمە لە بازار لەخاکی ئێراندا زەریوزارمان هەبوو. پاش ئەوەی مەحموودئاغا ئیشەکەی بۆجێبەجێ کردم، لە ماڵەوە وەکو جاران دەستم کردەوە بە ئیشوکار. بەڵام هەرچی دەمکرد خولقی ئیشکردنم نەبوو. هەمیشە وام دەزانی کە هەموو موڵکی کوردستان هیمن بووەو لێم داگیرکراوە. زۆرجاریش بیرم لەوە دەکردەوە لەعیراق دەرچمو خۆم بگەیەنمە لای مەلاماستەفا. هەرچەند کە نەشمدەزانی مەلامستەفا چۆنەو چی بەسەرهاتووە. چونکە هاتوچۆی مابەینی عیراقو ئێران نەماو دەرگای سنوور بەتەواوی داخراو ئەو کەسانەی کە دەهاتنە عیراقیش دەبوایایە لای ئاغایەک لە پشدەر خۆیان بزربکەن.

ئەو مەنگورو مامەشانەی کە پێشتر باسمان کردن کە لە دژی کۆماری مەهاباد هاتبوونە پشدەر، پاش تێکچونی کۆمارو دوای ئەوەی من گەڕامەوە ماڵەوە، ئەوانیش هاتنە هێرۆ بۆ ئەوەی لە رێگای بازاڕەوە هەرچی زووتر خۆیان بگەیەننە مەهابادو لای حکومەتی ئێران ئیسپاتی وجودو دڵسۆزی خۆیان بکەن. بەڵام بارینی بەفرو سەرمای ئەو کوێستانانە بوو بە هۆی ئەوەی کە رێگای زەلامو هاتوچۆ بگیرێتو ئەوانە بەناچاری چەند شەوو رۆژ لە ماڵی

مەحموودئاغا مانەوەو مەحموودئاغا رۆژێک ناردی بەشوێنمدا کە بچم بۆ لای. من ئیعتیرازم پێشانداو نەمویست سەروشکڵی ئەوانە ببینم. لە دواییدا مەحموودئاغا ناچاربوو بەهۆی خەڵکی گوندی هیرۆوە رێگایان بۆ پاک بکاتەوەو خۆیانو وڵاغ وشتەکانیان بگەیەنێتە ئەودیوی سنوور. دوو ئاغای میرئاودەلی "مەحموود هەباس ئاغا"و "مامەندی حاجی هەباس ئاغا"یان بۆ رێزلێگرتن لەگەڵدا ناردن تا گەیاندیاننەوە مەهاباد. دیارە ئەم کارە دابو نەریتی عەشایەری بوو، دەبوایە ئەنجام بدرێت. کاتێ ئەو ئاغا شاپەرستانەی مەنگوڕو مامەش گەیەشتنەوە مەهاباد، وایانزانی لەلایەن حکومەتی ئێرانەوە زۆر پێشوازی دەکرێنو رێزیان لێدەگرن. بەڵام هەرکە گەیشتنەوە مەهاباد، بە هۆی فەرمانێکی تایبەتی شای ئێران هەموو عەشایری کوردستانی ئێران چەک کران. ئەو شاپەرستانەش هەر ئەو رۆژە لە جیاتی بەخێرهاتنیان چەکیان لێوەرگیراو سووکو ریسوای ناو گەلی خۆیان کرانو هەر ئەوەشە ئەنجامی خزمەتکردن بە "بێگانە".

### بارودۆخی خەڵکی مەهابادو بارزانیەکان دوای رووخانی کۆمار

دوای ئەوەی کە مەلامستەفا لەگەڵ هەموو بارزانیەکان لەمەهاباد دەرچوونو رۆیشتە لای نەغەدەو شنۆ، سوپای ئێرانیش گەیەشتە مەهاباد. پاش دوو رۆژ مەلامستەفا نووسراوێکی بۆ سەرتیپ "هومایوونی" ناردو بەمەرجێ لەلایەن "شا"وە ببخشرێت، ئامادەیی خۆی بۆ خۆبەدەستەوەدان پێشاندا. لەسەر داواو بروای سەرتیپ هوومایوونی ئەم پێشنیارەی مەلامستەفا زۆر بە گەرمی وەرگیرا. مەلامستەفا هاتە مەهابادو چاوی بە هوومایوونی کەوت. داوای مەلامستەفا ئەوەبوو کە حکومەتی ئێران کارێکی وابکات بەڵکو بەریتانیا ببێتە "دەستەبەر" کە بگەڕێنەوە عیراقو عەشایری خۆیان نیشتەجێ بکەنەوە. سەرتیپ هوومایوونی دوای پەیوەندیکردنی لەگەڵ تاران بە مەلامستەفای راگەیاند کە دەبێ بچێتە تارانو لەوێ چاوی بە کاربەدەستانی بەرزی میری بکەوێت. بۆ ئەو مەبەستە راستەوخۆ قسە لەگەڵ باڵوێزی بەریتانیا بکات.

مەلامستەفا رازیبوو و لە ٢١ی کانوونی دووەمدا لەگەڵ ئەفسەرێکی عیراقی بە ناوی "نووری ئەحمەد تەها"و چەند نەفەر بارزانی کەوتە ڕێگا. سەرتیپ هوومایوونی وای بەباش دەزانی کە ئەفسەرێکی ئێرانیشیان وەکو چاوساغ لەگەڵدا بنێرێت. تا ئەو ڕۆژە کە مەلامستەفا بەرەو تاران دەکەوتە ڕێگا، هیچجۆرە دەستدرێژییەک بەرامبەر بە خەڵکی مەهاباد نەکراو هەمووشت ئاسایی بوو. بەڵام هەر ئەو ڕۆژەی کە مەلامستەفا بەرەو تاران دەرچوو، قازیمحەممەدو هەڤاڵەکانی هەموو کۆ کرانەوەو داوای ئەو چەکو تەقەمەنییانەیان لێکردن کە لە ڕوسیا وەریانگرتبوو. ئەوانیش وەڵامیان هەر ئەوەبوو کە ئەو چەکانە بەسەر خەڵکی کوردستاندا دابەشکراون‌و لەتوانای ئێمەدا نییە کە وەریانبگرینەوە. ئیتر بەمبەهانەوە قازیمحەممەدو سەیفیقازی‌و چەند کەسانێکیتر لە لێپرسراوانی کۆمار خرانە ناو بەندیخانەوەو لیژنەی لێکۆڵینەوەیان بۆ پێکهێنان‌و بە ناوی جیاوازیخواز تاوانباریان کردن. سەدری قازیی برای قازیمحەممەدیشیان لە تارانەوە بە بەندکراوی ناردەوە "مەهاباد"و لەگەڵ ئەوانیتر خرایە ناو بەندیخانەوە. ئەو لیژنەیەی کە دایاننابوون بۆ لێکۆڵینەوەو دادگاکردنی قازیمحەممەدو هەڤاڵەکانی، هەموویان ئەندامانی لیژنەی ئەفسەرانی سوپای ئێرانی بوون. ڕێگاشیان بە قازیمحەممەدو ئەوان نەدا بۆ خۆیان پارێزەر بگرن‌و حکومەت خۆی ئەفسەرێکی بە ناوی پارێزەر بۆ دەستنیشان کردن تاکو لە دادگادا بەرگریان لێبکات.

تاوانەکانی قازیمحەممەدو هەڤاڵەکانی کە لەدادگا ئاراستەیان کرا، ئەو چەند مادەی خوارەوەبوون:

١- جیابوونەوە لە حکومەتی مەرکەزی‌و پێکهێنانی حکومەتێکی سەربەخۆی کوردی.

٢- گۆڕینی ئاڵای ئێرانی‌و لابردنی دروشمی ئاڵای حکومەتی مەرکەزی. (دروشمی ئاڵای ئێران شێرێک بوو کە خۆرێکی لە سە پشتی بوو، بەڵام دروشمی ئاڵای کۆمار، لە ناویدا دووگوڵی گەنم و قەڵەمێک دانرابوو.)

٣- پێکهێنانی سوپای سەربەخۆو جیاواز لە سوپای ئێران لە کوردستاندا.

٤- شەڕکردن لەگەڵ سوپای ئێرانو کوشتنی سەدان ئەفسەرو سەربازی ئێرانی.
٥- لەناوبردنی شتومەکی حکومەتی ئێران لە ناوچەکانی کوردستاندا.
٦- هاوکاریکردن لەگەڵ بێگانەو یارمەتیدانی بۆ داگیرکردنی نیشتمانی ئێرانو چەند تاوانیتر بە ناوی خیانەتی گەورە خرابوونە پاڵیان.

قازیمحەممەدیش لە وەرامی دادگادا گوتبووی من هەرچی کردومە هەمووی لە ژێر گوشاری میللەتی کورد بووە کە ئەو چەند ساڵانە حکومەتی مەرکەزی لە لایەن داگیرکەرانی بێگانەوە وەک پێویست رێگای پێنەدراوە بێتەوە کوردستانو یاساو دەسەڵاتی خۆی دابمەزێنێتەوەو ئێمەش ناچار بووین کە بەقسەی خەڵکی کوردستان بکەین. بێگانەکانیش هەر ئەمکارەیان دەویست کەوا ئێمە دەسەڵاتێکی تایبەتی لە کوردستان دروست بکەین.

### وتووێژی مەلامستەفا لەگەڵ شا

مەلامستەفا ماوەی مانگێک لەتاران مایەوەو لەوێ چاوی بە "شا" کەوتو باڵیۆزی بەریتانیاشی دیت. باڵیۆز پێی گوتبوو ئێمە ناتوانین دەستەبەری ئەوە بکەین لە عیراق هیچتان لێنەکەن، بەڵام وا باشترە کە خۆتان راستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ حکومەتی عیراق بگرنو بۆ گەڕانەوە زەمانەت وەربگرن.
مەلامستەفا دووجاریش چاوی بە شا کەوتبوو، پێی گوتبوو ئەگەر ئێوە لە ئێران دەمێننەوە، دەبێ بێنە ناوچەی "هەمەدان"و لەوێ نیشتەجێ بنو چەکەکانیشتان دابنێن. مەلامستەفا گوتبووی زۆر باشە من رازیمو دەچمەوە لای برا گەورەم "شێخ ئەحمەد" کە بەڵکو رازی بێت. لێرەدا مەبەستی مەلامستەفا ئەوە بووە خۆی لە دەستی شا رزگار بکاتو هەرچۆنێک بوو خۆی وا پێشاندا کە بۆ چەکدانانو دامەزران لە هەمەدان ئامادەیە. شا ئەفسەرێکی تایبەتی خۆی لەگەڵ مەلامستەفادا نارد بۆ نەغەدە هەتا بە ناوی شاوە لەگەڵ شێخ ئەحمەد قسەبکاتو هەروەها لە تارانیشەوە فەرمان درایە سەرتیپ هوومایوونی کە هەرچی زووتر تەرتیباتی راگوازتنی ماڵە بارزانیەکان بۆ هەمەدان بکات. کاتێ

ئەو ئەفسەرەی نێردراوی شا لەگەڵ مەلامستەفا گەیشتە لای شێخ ئەحمەدو قسەکانی شای ئێرانی بە شێخ ئەحمەد راگەیاند، وەرامی شێخ ئەحمەد تەنیا هەر ئەوەبوو، گوتی ئێمە هەرگیز چەک دانانێین‌و ناشچینە هەمەدان. ئەگەر ئەو زستانە وازمان لێبهێنن، لە کاتی بەهاردا بە شەڕ یان بە ئاشتی دەگەڕێینەوە خاکی عیراق. ئەفسەرەکە گەڕایەوە بۆ تاران‌و لە ۹ی شوباتی ساڵی ۱۹٤۷دا سەرتیپ هومایوونی خۆی لەگەڵ دوو نەفەر سەرباز هاتە "نەغەدە" بۆ لای شێخ ئەحمەدو مەلامستەفاو زۆر قسەی لەگەڵا کردن کە بۆ بەجێهێنانی فەرمانی شارازیان بکات. هەر ئەو رۆژە سێ رێگای بۆ دانان کە لەم سێ رێگایە یەکێکیان بۆ خۆیان هەڵبژێرن:

١- گەڕانەوەی هەرچی زوور بۆ عێراق

٢- مانەوەی بێچەک لە خاکی ئێراندا

٣- شەڕکردن لە گەڵ سوپای ئێران

هەر ئەو رۆژە سەرتیپ هومایوونی گەڕایەوە بۆ مەهاباد. کاتێ بۆی دەرکەوت بارزانیەکان گوێ بە فەرمانی حکومەت نادەن‌و لەسەر رای خۆیان سوورن، لە ۲۲ی شوباتی ساڵی ۱۹٤۷دا سوپای ئێران لە مەهابادەوە بەرەو "نەغەدە" بە نیازی شەڕکردن لەگەڵ بارزانیەکان خستە رێگا. ئەوانیش چونکە ناوچەی نەغەدە جێگای شەڕلێکردن نەبوو و نەیاندەتوانی لەم دەشتە ئاوەلایەدا بەرامبەر بەسوپای نیزامی ئێران بوەستن، ناچاربوون هێزی چەکدارو ماڵو منالیان بەرەو "شنۆ"و تەرگەوەڕ راگوێزن. لەم ناوچانەدا کە پڕ لە بەفر بوون‌و  ساردی‌و سەرمای زۆر باڵی بەسەردا کێشابوو، دامەزران‌و ئامادەی شەڕ بوون. پێش ئەوەی  شەڕ دەستپێبکات، رووداوێکی ناخۆش رووی‌داو بوو بەهۆی ناشیرین‌بوونی بارزانیەکان لەبەرچاوی هەندێ لەعەشایرەکانی ئەو ناوچەیە. رووداوەکە لەوەوە هات کە چەند چەکدارێکی بارزانی‌یەکان لە کاتی کشانەوەیاندا لە نەغەدەوە بۆ لای شنۆ، دەگەنە گوندی "سێلوێ"ی ناوچەی مامەش. لەوێ چەند چەکدارێکی عەشایری لە خزم‌و کەس‌وکاری مام عەزیزی قەرەنی‌ئاغا. ئەو مام عەزیزەی کە لە دژی کۆماری مەهاباد بۆ لای پشدەر رای

کردبوو. ئەو چەکدارانە لەو گوندەدا دەبن. بارزانیەکان داوایان لێدەکەن کە یا دەبێ بڕۆن و گوندەکە چۆڵبکەن، یا هەتا بارزانیەکان لە گوندەکە تێدەپەڕن، چەکەکانیان دابنێن. چونکە بارزانی‌یەکان لە ئاغا مامەشەکان پشتقایم نەبووبوون، ترسی ئەوەیان هەبوو لەدواوە تەقەیان لێبکەن. ئاغا مامەشەکانیش رازی نەبووبوون چەکەکانیان دابنێن و لێیان دەبێتە دەمەقالێ. لەئەنجامدا بارزانیەکان بە چەکی "غەدارە" دەستپێژ لە مامەشەکان دەکەن و هەر بە یەکەم دەستڕێژ ١١ ئاغای مامەش دەکوژرێن. ئەم رووداوە ناخۆشە زیاتر بوو بە هۆی ئەوە کە عەشایری مامەش و هێندێ لە خەڵکی ناوچەکەش بکەونە دژایەتی راستەوخۆ لەگەڵ بارزانیەکان و توندتر لە جاران پشتی حکومەتی ئێران بگرن. پاش ئەو رووداوە، عەشایری ناوچەکە لە لایەن حکومەتی ئێرانەوە بە تێکڕایی چەکیان پێدراو ئەوانەی حەزیشیان نەدەکرد چەک هەڵبگرن، بە زۆر پێیان هەڵگرتن و هێنایاننە مەیدانی شەڕ. تەنیا ئەو عەشایرانەی کە خۆیان بە دەستەوە نەدابوو، لە ناو چیاکانی سەرسنووری عیراق خۆیان پەنا دابوو، زێڕوبەگی هەرکی، رەشید بەگی هەرکی و نووری بەگی هەرکی بوون. دوای ئەوەی سوپای ئێران گەیشتە ناوچەی "نەغەدە"و چەند شەڕێک دەستی پێکرد، ئەوانیش ناچاربوون خۆیان بەدەستەوە بدەن و چەکهەڵبگرن. تەنیا زێڕۆبەگ چونکە دەیزانی لە کوشتن زیاتر بۆی نامێنێتەوە، نەیتوانی خۆی بەدەستەوە بدات. ناوبراو رای‌کرد بۆ عیراق و لەلایەن حکومەتی عیراقەوە چەند مانگێک خرایە بەندیخانەوە. لە ئەنجامدا "فەتاح ئاغای هەرکی" سەرۆکی عەشایری هەرکی عیراق توانی بە پارەو بەرتیل رزگاری بکات. فەتاح ئاغا ئەو کاتە لە پارلمانی عێراق ئەندام بوو. زێڕۆبەگ هاتە ناوچەی "حەریر" و لەوێ نیشتەجێ کرا.

### دەستپێکردنی شەڕ لە نێوان بارزانیەکان و ئێراندا

لە رۆژی ١٤ی مارتی ساڵی ١٩٤٧دا هێرشێکی درندانە لەلایەن سوپای ئێرانەوە کرایە سەر بارزانیەکان. فیرقەیەکی تەواو لەگەڵ هەموو چەکدارەکانی عەشایری

کوردو تورکو فارس لەم هێرشەدا بەشداربوون. هەموو جۆرە چەکێکی گران لە تۆپو دەبابەو فڕۆکە لەدژی بارزانیەکان دەکار کران. پاش چەند رۆژ شەڕو لێکدان، بارزانیەکان سەرکەوتنیان وەدەستهێناو زیانێکی زۆری گیانیو ماڵی‌یان بە سوپای ئێران گەیاندو لەو شەڕەدا جگە لە تەقەمەنیو کەلوپەلێکی زۆر کە کەوتە دەستی بارزانیەکان، ٦٠ سەربازو چوار ئەفسەریشیان بە دیل گرت. بەڵام ئەوەی کە پەکی بارزانیەکانی خستو شپرزەی کردن، دووشت بوون. یەکەمیان سەرمای زستان و بەفری زۆر و دووەمیان نەبوونی ئازووقەو خواردەمەنی بۆ خۆیانو ماڵو منداڵیان. ئەگەر خەڵکی خێرەومەندی ناوچەکە یارمەتی نەدابان، چونکە خۆیان هیچ شتێکیان نەبوو، لە برسان دەمردن. لە ئەنجامدا خەڵکی ناوچەکەش لە توانای‌دا نەما ژیانی ئەو هەموو ماڵو خێزانانە دابین بکات. بەمهۆیەوە بارزانیەکان کەوتنە تەنگاویو نەبوونیو برسیەتی پەکی‌خستن. ناچاربوون هەموو دیلەکانی گرتبوویانن بەرهەڵدا بکەنو بیاندەنەوە دەست حکومەتی ئێران. خۆشیان بەرەو سنووری عیراق پاشەکشەیان کردو لە ١٣ی مایسی ساڵی ١٩٤٧دا کۆتایی‌یان بە شەڕ هێناو گەیشتنە سەرسنووری عیراق خەتی سێ‌کوچکەی نێوان عیراقو ئێرانو تورکیا کە دەکەوێتە ناوچەی برادۆست. ئەو کاتە هەموو چیاو شاخەکان پڕ لە بەفر بوونو حکومەتی عیراقیش هێزی گەرزکی هێنابوە نیزیکی سنوورو ماوەی نەدەدا بارزانیەکان بە چەکەوە بکەونە ناوخاکی عیراقەوە. لە ئەنجامدا شێخ ئەحمەدی بارزانی بۆ ئەوەی ماڵومنداڵی بارزانیەکان لەو سەرماو برسیەتیە رزگار بکات، بە ناچاری دەستی کرد بە پەیوەندی لەگەڵ بەرێوەبەری شورتەی گشتی "سەید عەلی حجازی" بۆ ئەوەی خۆی بەدەستەوە بدات. سەید عەلی حجازی هاتە گوندی "خرێنە"ی سەر سنووری ئێرانو لەگەڵ شێخ ئەحمەد رێککەوتن کە هەموو بارزانیەکان بەبێ "قەیدو شەرت" چەک دابنێنو خۆیان بەدەستەوەبدەن. بەڵام مەلامستەفا نەیدەتوانی ئەم مەرجە بسەلمێنێتو بگەڕێتەوە عیراق، چونکە دەیزانی لە کوشتن زیاتری بۆ چاوەروان ناکرێت. لە سەر ئیزنی شێخ ئەحمەد، ژمارەی ٥٠٠ چەکداری بارزانی لەوانەی کە

زگورتی‌و بێ ژن‌و‌ماڵ بوون، هەڵبژاردو بەرەو سنووری روسیا کەوتە ڕێگا. عەشایری بارزانیش بە تێکرایی لەگەڵ شێخ ئەحمەد گەڕانەوە عیراق‌و هەموویان بە خاوو خێزانەوە هێنانە ڕەواندوزو لە "دیانان" بۆ ماوەی چەند ڕۆژ خستیاننە ناو "تەل درک"ەوە پاشان میللەتەکایان ناردەوە ناوچەی بارزان‌و هەرکەس لە سەر گوندی خۆی نیشتەجێ کرانەوە. شێخ ئەحمەدو چەند کەسانی‌تر لە شێخەکانی بارزان خرانە بەندیخانەوەو لەپاش دادگاکردنیان حوکمی ئێعدامیان بۆ دەرچو. باڵام لەبەر هێندێ هۆی سیاسی حوکمەکەیان جێبەجێ نەکراو بۆیان کرایە حوکمی هەتاهەتایی (موئەبەد)و ڕەوانەی باشوری عیراقیان کردن. ئەو چەند ئەفسەرانەی عیراقیش کە لەگەڵ شێخ ئەحمەد خۆیان دایە دەست حکومەتی عیراق، درانە دادگای عەسکەری‌و بەناوی خیانەت ئێعدام کران‌و بوونە قۆچی قوربانی لە پێناو ڕزگاری گەل‌و وڵاتەکەیاندا. ئەم ئەفسەرە قارەمانانەی ئیعدام کران، ئەمانەبوون:

١- عیزەت عەبدولعەزیز

٢- مستەفا خۆشناو

٣- خەیروڵلا عەبدولکەریم

٤-محەممەد قودسی

ئەمانە هەرچەند بەدەستی چەپەڵی ڕژێمی پاشایەتی ڕژێمی دوژمن بەگەل‌و نیشتمان خرانە سێدارەوەو لەناوچوون، بەڵام هەرگیز نەمردون‌و هەمیشە لە ناودڵی میللەتەکەی خۆیاندا دەژین. ئەمانە ئاواتیان هەر ڕزگاری کوردو کوردستان بوو. ئەوانە تا ئەو کاتەش کە پێیان ڕاگەیاندن لەپاش دوو سەعاتی‌تر ئێوە دەکوژرێن، هیچ نەشڵەژان و "وەسیەتنامەیەکی مێژوویان بەمۆری هەر چواریان بۆ گەلەکەیان بەجێ هێشت کە بریتی بوو لەوچەند دێڕانەی خوارەوە":

***"ئێمە لە پێناوی گەل‌و نیشتماندا ڕۆیشتین‌و گیانی خۆمان بەخشی. تکامان لەگەڵی کورد ئەوەیە کە یەکبگرن‌و دوای نەزانین(جەهل)نەکەون."*** ئەمانە ڕویشتن‌و ئەم ئامۆژگاریە بەنرخەیان لە دوای خۆیان بەجێ‌هێشت. نەک هەر بە

قسەیان نەکراو هیچکەس پەیڕەوی لە ئامۆژگاریەکانیان نەکرد، بەڵکو ڕۆژ بە ڕۆژ ناکۆکیو دووبەرەکی زیاتر پەرەی سەندو زۆربەداخەوە هەر بەدوای نەزانیشدا دەرۆن..

## لە سێدارەدانی قازیمحەممەدو هەڤاڵەکانی

دوای ئەوەی هێرشی سوپای ئێران بۆسەر بارزانیەکان دەست پێکرا، لەشەوی ٣١ی مارتی ساڵی ١٩٤٧دا "قازیمحەممەد"و "سەدری قازی" برایو "سەیفی قازی" ئامۆزای لە مەیدانی چوارچرای مەهاباد خرانە پەتی سێدارەو بەدەستی چەپەڵی پیاوکوژانی حەمەرەزاشای ئێران شەهیدکران. مەیدانی چوارچرا ئەو مەیدانە بوو کە ساڵی پێشتر قازیمحەممەد لەو مەیدانەدا لەلایەن خەڵکی کوردستان وەک سەرۆک کۆمارو پێشەوا هەڵبژێردراو هەر لەو ڕۆژەشدا هیواو ئاواتی خەڵکی کوردستان وەدیهاتو ئاڵای سێرەنگی کوردستان هەڵکرا. پاش یەکساڵ تێپەڕبوون بەسەر تەمەنی ئەو کۆمارە کۆرپەیەدا، هەموو خۆشیو شادمانیەکانی گەلی کوردی هەژار وەرگەڕایەوەو جارێکیتر جگە لە شیوەنو گریانو قوڕپێوانو فرمێسکو خوێن بۆی نەمایەوە. ڕاستی ئەگەر باش سەرنج بدەینە مێژووی کورد، دەبینین چارەنووسی ئەو گەلە هەر ئەوەبووەو هەمیشە لەلایەن دوژمنانەوە خراوەتە بازاڕی مامەڵەی کڕینو فرۆشتنو هیچ کاتێ ماوەی ئەوەی پێ نەدراوە داری ئازادی بە خوێن ڕسکاوی لقو پۆپ بکاتو بەربگرێت، بەڵکو هەر بەشێنو شلکی خراوەتە سەرزەویو پێشێل کراوە.

لەدوای لەداردانی قازیمحەممەدو هەڤاڵەکانی، "حەمیدی مازوجی"و "عەلیبەگی یەکشەوە" کە یەکەمیان خەڵکی مەهابادو ئەویتریان خەڵکی بۆکان بوو، لەگەڵ کەسانیتر لەدار دران. عەلیبەگ هێندێ خزمایەتیو ژنو ژنخوازیشی لەگەڵ قازیمحەممەد هەبوو و من هەر دووکیانم باش دەناسی. حکومەتی ئێران ئەم دوانەی زۆر لا گرینگ بوون، بۆیە بۆیە بڕیاری لە سێدارەدانی بۆدەرکردن. پاش ئەوە خەڵکێکی زۆر نەیانوێرا خۆیان بەدەستەوە

بدەن‌و دەربەدەر بوون‌و ناچار هەندێکیان هاتنە عیراق‌و لەناو خەڵکی کوردستانی عیراقدا خۆیان حەشاردا. ئەو کاتە سەرۆک عەشیرەتیەکانی عیراقی ئەوەندە نفووزو دەستەڵاتیان هەبوو کە خەڵکی لیقەوماو و دەربەدەر لای خۆیان پەنا بدەن. چەند کەسێکی خەڵکی مەهاباد هاتنەلای مەحموودئاغای هێرۆو لەوانە یەکێکیان سەیدمستەفای سەیدی‌و ئەوەی‌تریان حەمەی مولوود بوو. مەحموودئاغا زۆر رێزی لێگرتن‌و لەدواییدا سەیدمستەفا فەرمانی بەخشینی بۆ دەرچوو و گەڕایەوە مەهابادو حەمەی مەولوودیش ماوەیەک هاتە قەڵادزێ‌و دەفتەرنفوسی عیراقیشی بۆ وەرگیرا. بەڵام لە دواییدا لە رێگای قاچاغەوە رۆیشت بۆ روسیاو لەوێ بەپەناهندە وەرگیرا. وەزعی مەهاباد بەمشێوەیە بوو کە باسمان کرد. هەموو شارەکانی‌تری کوردستانیش کە پشتیوانیان لەکۆماری مەهاباد کردبوو، کەوتنە ژێر حوکمی عەسکەری‌و توندوتیژی رژێمی شای ئێران. ئەو توندو تیژییە هەتا ساڵێک دەوامی کردو لەنەنجامدا فەرمانی بەخشینی گشتی (عەفوی عام) دەرچوو. جگەلە چەند کەسانێکی دیار هەموو ئەم خەڵکەی گیرابوون‌و دەربەدەر کرابوون، گەڕانەوە ماڵ‌و جێگای خۆیان‌و تاڕادەیەک باری کوردستانی ئێران هاتەوە دۆخی جارانی.

## چۆنیەتی رۆیشتن‌و گەیەشتنی مەلامستەفا بەروسیا

مەلامستەفا پاش ئەوەی لە شێخ ئەحمەدی براگەورەی جیا بۆوە، بەرەو سنووری روسیا کەوتە رێگاو هەرجارە خۆی دەخستە سەر سنوورێک لە سنوورەکانی تورکیاو ئێران‌و لەزۆربەی جێگاش لەگەڵ سوپایەکانی ئەو دوو حکومەتە تووشی شەڕ دەهات‌و هەرجارە یەکێک لەم دوانە گەمارۆی دەدان. بەتایبەتی فرۆکەکانی ئێران هەمیشە بەدوایانەوە بوون‌و لە زۆر شوێن بۆمبارانیان دەکردن‌و ماوەیان نەدەدان کە لە شوێنێک بە تەواوی پشوو بدەن. مەلامستەفا خۆی بۆ منی گێڕایەوەو گوتی:

***"ئێمە ٢٩ رۆژی تەواو بە رێگاوە بووین‌و زۆر بەهیلاکی‌و ماندوویەتی خۆمان گەیاندە سەر ئاوی "ئاراز" لە سنووری مابەینی ئێران‌و روسیا. گوتی***

*منو چەند کەسێکیتر نەبێ، ئەوانیتر "مەلەوان" نەبوونو "مەلە"یان نەدەزانیو رووبارەکەش زۆر قووڵ بوو، بواری نەدەداو ناچاری بووین هەرچۆنێک بێت خۆمان بخەینە ناویو دەرباز بین. ئەوانەی "مەلەوانی"یان دەزانی، یارمەتی ئەوانیتریاندداو لە رووبارەکە پەڕینەوە، تەنیا زەلامێکمان لێ خنکاو لەرێگاش یەکێکمان لێ شەهیدکرا. لەم دوو نەفەرە زیاتر زیانی گیانیمان نەبوو. هەر کە گەیشتینە خاکی روسیا، چەکەکانیان لێوەرگرتینو پاش چەند رۆژ حەسانەوە، ئێمەیان بەسەر کۆمارەکانی روسیادا دابەش کردو هەرسێ چوار کەسیان لەشارێک نیشتەجێ کرد. بۆ ئەوەی خۆمان ژیانی خۆمان دابین بکەین، لە سەرکارگە"و شت دایانمەزراندین"*

وەکو خەڵکیتر کاریان بە مەلامستەفاش ئەسپاردبوو.

راستی ئەم رۆیشتنە دووورودرێژو پڕ مەترسییەی مەلامستەفاو هەڤاڵەکانی کارێکی زۆر قارەمانانەو مجازەفەیەکی هەرە گرنگ بوو. زۆربەی ئێستگە رادیۆییەکانی بێگانەو بە تایبەتی ئێستگەی "لەندەن" ئەم هەواڵەیان بڵاوکردەوەو دانیشیان بەو راستیەدا هێنا کە پەڕینەوەی مەلامستەفا لەئاوی "ئاراز" کارێکە کە "مێرخاسی"(عبقریەتی) مەلامستەفای بە هەموو کەسێک سەلماند. مەلامستەفا بۆی گێرامەوەو گوتی:

*"من یەکەم جار لە کۆماری ئازربایجان دانراموو کاربەدەستانی ئەم کۆمارە زۆر بەچاوێکی سووک سەیری ئێمەیان دەکرد. منیش هەرجارە وەکو شکایەت لە کاربەدەستان، راپۆرتو شتم بۆ لیژنەی مەرکەزی حیزبی شیوعی روس دەربارەی وەزعی خۆمان دەنووسی. لە راپۆرتێکدا نووسیم کە "بێریا"و چەند کەسیتری لێپرسراوی "خائینن" پەیوەندیان بە بێگانەوە هەیەو بەچەند بەڵگەش دەرمخست کە ئەوانە دژی سیاسەتی روسیا کار دەکەن. من ئەم هەموو راپۆرتانەم ناردن بۆ مۆسکۆو لەپاش یەک دوو ساڵ لێژنەیەکی لێکۆڵینەوەیان بۆ ئازربایجان نارد. بەنەهێنی کەوتنە لێکۆڵینەوە و لە ئەنجامدا بۆیان دەرکەوت کە راپۆرتەکانی من هەموو راست دەرچوون. "بێریا"و هەموو کاربەدەستانیتر ئیعدام کرانو زۆریشی پێنەچوو ستالینیش مرد. ئەوجار*

*لەکۆمیتەی ناوەندی حیزبی شیوعیەوە بریار دەرچوو کەوا لە ئازەربایجانەوە بگوێزرێنەوە بۆ مۆسکۆ. دوای مردنی ستالین زۆر رێزم لێگیراو جێگای تایبەتیان بۆ تەرخان کردم و خستمیانە پەیمانگای زمانی روس‌و بارزانیەکانی‌تریش ئەوانەی گەنج‌و تازە پێگەیشتو بون، هەموویان خستنە قوتابخانەوەو ئەوانی‌تریشیان لەسەر ئیش‌وکاری باشتر لە جارانیان دامەزراندن. رێگاشیان پێدان سەردان‌و دیدەنی یەکترو هاتوچۆی شارەکان بکەن."*

پێشتر زەمانی ستالین ئەم شتانەیان لێ قەدەغەکرابوو. بارزانیەکان ئەو چەندساڵانە فێری زمانی روسی بوون و هێندێکیشیان ژنی روسیان هێنابوو. دەیانگوت مەلامستەفاش ژنێکی روسی لەوێ مارەکردبوو، بەڵام کەپرسیارم لێکرد، گوتی شتی وا نەبووە وژنی روسیم نەهێناوە. بارازنیەکان ماوەی ١١ ساڵی رەبەق لەروسیا مانەوەو هەتا ساڵی ١٩٥٨ شۆرشی١٤ تەمووز کە عەبدولکەریم قاسم هاتە سەرحوکم. ئەوجار رێگای گەرانەوەیان پێدراو هەموویان هاتنەوە وڵاتی خۆیان.

## روون کردنەوەیەک

لێرەدا دوور نییە خوێنەری خۆشەویست پرسیار بکات‌و بیەوێ تێبگات داخوا ئەو بریارنامەیەی مابەینی روسیاو ئێران دەربارەی نەوتی "باکور" چی بەسەرهات‌و ئەنجامەکەی چی بوو؟ وەرام ئەوەیە پاش ئەوەی حکومەتی تاران هەموو گیروگرفتەکانی جێبەجێ کردو هەردوو کۆماری تەورێزو مەهابادی لەناوبردن، ئەوجا "قەوامولسەڵتەنە" دەستی لەکار کێشایەوەو وازی لە سەرۆک وەزیری هێنا کە ئەمەش خۆی فێڵێکی سیاسیی دیکە بوو کە بەکاری هێناو خۆی پی لە دەستی روسیا رزگار کرد. ئەمەش لەبەر ئەوە بوو، چونکە پێشتر زۆر وەعدەو وەعیدی بە درۆی بە روسیا دابوو، نەدەویست لە رووی سیاسیەوە بکەوێتە ژێر رەخنەی روسیا. ئەوە بوو کە بەفەرمانی "شا" وەزارەتی تازە لە ئێران پێکهات‌و ئەم سێ وەزیرەی کە لە حیزبی "تودە"ش

هاتبوونە ناو وزارەتەوە، ئەوانیشیان دەرکردن چونکە حیزبی تودە "مارکسی"و سەربە روسیابوو، ئیجازەی چالاکی ئەویش هەڵوەشیندرایەوە. بەمشێوەیە حکومەتی روسیا لە خشتە براو جگە لە شکستو شەرمەزاری شتێکیتری دەست نەکەوتو ئەو بڕیارنامەش کە قەوامولسەڵتەنە لەگەڵ روسیا مۆری کردبوو، هەتا هەتایە بۆیان خستە ناو "زبڵدانی"ی مێژوو.

## نرخاندنو هەڵسەنگاندن بۆ قازیمحەممەد

قازیمحەممەد خۆی وەکو هەموو مرۆڤێک زۆر لایەنی چاکی هەبوو، چەند کەموکورتیشی پێوە دیار بوون:

١- قازی محەممەد لە بنەماڵەیەکی ناسراوی کوردستانی ئێرانو دانیشتوی شاری مەهاباد بوو. ئەو بنەماڵەیە هەر لە زەمانی کۆنەوە لە بواری ئایینیو پارێزگاری دەوریان هەبووەو هەمیشە پیاوانی ئەهلی ئایینو مزگەوتیان لێ هەڵکەوتوەو خەڵکی موسوڵمانی ئێران زۆر رێزی لێگرتون. زۆر مرۆڤی واشیان لێهەڵکەوتووە کە سەربزێو بوونەو بەربەرەکانی رژێمەکانی ئێرانیان کردوەو هیچکاتێ سەریان لە عاستی زوڵمو زۆر دانەنواندوە. بۆ وێنە "میرزا فتاحی قازی" یەکێک بووە لە بنەماڵەی قازیەکانو هەمیشە دژی رژێمی موزەفەرەدینشای قاجار بووەو لەلایەن هەردوو رژێمەکانی ئێرانو تورکیاوە تاقیب کراوەو فەرمانی کوشتنی بۆ دەرچووە. جارێکیان وا رێکەوتوە کە میرزافتاح بەناوی وتوویژ بۆ تەوریز بانگهێشتن کراوەو لەوێ شای قاجار خستویەتیە بەندیخانەوە. لەپاش ماوەیەک مانەوە لە بەندیخانەدا ئەم پارچە شیعرە بەفارسی بۆ شا دەنووسێت کەمن هەموویم بە تەواوی لەبیر نەماوە:

جبین پرچین گمان کردی کە من سام نریمانم
کشیدی زیر زنجیرم مکان دادی بە زندانم
نیم یوسف کە جایم دادەای درگوشەی زندان
نیم یعقوب کە تا مأوا دهی در بیت احزانم
حدیث اکرم الضیف از نظرها محو شد گویا

**اگر من کافرم آخر بەاهل این شهرمهمانم**

واتە:

ئەی پاشای نێوچاوان گنجاوی مەگەر من پاڵەوانی ناودارم، وا منت خستۆتە ناو بەندیخانەوە؟ خۆ من یووسف نیم بەم چەشنە لە زیندانت خستووم. یەعقووب نیم کە خستووتمە گۆشەی بەندیخانە. دەڵێن حەدیسی "اکرم‌الضیف لە بیر خەڵک چۆتەوە، خۆ ئەگەر کافریش بم، میوانی خەڵکی ئەم شارەم.

ئەمجا کاتێ ئەم شێعرانەی میرزا فەتاح دەگاتە دەستی شا ئەمیش بەم شیعرانەی خوارەوە وەڵامی میرزا فەتاح دەداتەوە:

**کمان ابرو گمان کردی کە من سالار ترکانم**

**کە از راهم توان بردن بە این نیرنگ و افسانم**

**سگ درندە را جهل است بند از پایْ بگشایند**

**نەشاید بر من این معنی کە پند آموز لقمانم**

**حدیث اکرم الضیف ار بدانستی نمیرندی**

**تو جادوگرو من موسی و زنجیر است ثعبانم**

واتە:

ئەبرۆ کەوان تۆ پێت وایە من سەرداری تورکانم کە گیرۆدی فێڵو ئەفسوونەکانت بم. نەزانییە ئەگەر پەت لە پێی سەگی دڕندە بکەمەوە. بەمجۆرە فێڵم لێ ناکرێت چونکە من ئەوەندە زانام لوقمانی زانا لەلای من فێری زانین‌و تێگەیشتن دەبێت. ئەگەر لە حەدیسی "اکرم‌الضیف" تێگەیشتبای ئەم پەندەت بەسەر نەدەهات، تۆ وەک جادووگەر وای و منیش وەک مووسام و ئەو زنجرەی لە پای تۆدایە مارەکەی دەستی مووسایە.

ئەوەبوو لەدوای مانەوەی چەندساڵ لە بەنیخانەدا ئەمری بەخشینی بۆ دەردەچێت‌و دەگەڕێتەوە مەهاباد.

٢- قازی‌محەممەد پلەی خویندەواری زۆرباش بوو. لە قوتابخانەی ئاینی"عیلم‌و شەرع" خوێندبووی. جگەلەوەش زۆر خۆی بە خوێندنەوەی کتێبە سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتیەکانەوە خەریک کردبوو. زمانی فەرەنسی دەزانی‌و تا

رادەیەکیش دەیتوانی بە زمانی روسی قسە بکات. زمانی تورکیو فارسی لەکوردی باشتر دەزانینو بە زمانی عەرەبیش زۆر جوان قسەی دەکرد.

٣- مرۆڤێکی نیشتمان پەروەر بوو. رزگاری کوردستانی بەلاوە گەورەترین ئاوات بوو.

٤- زۆر خۆ بەکەمگر (متواضع) بوو. ئەو کاتەی کە بۆ سەکۆماری کوردستانیش هەڵبژێرا هیچ گۆرانێکی بە سەردا نەهاتو هەمیشە خۆی بەخزمەتکاری میللەت ناو دەبرد و دژی (کەشخە و فەخ فەخە)بوو.

٥- زۆر هێواشو هێمن بوو. نەیدەزانی تورەیی چیەو زۆر جار سەری لە فەقیرو هەژاران دەداو دەردی لێقەوماوانو هەژارانی تیمار دەکرد. زۆر جار لە کیسەی خۆی پارەی دەبەخشی.

٦- لە خوێندنەوەی "وتار" زۆر بلیمەت بوو. دڵی گوێگرانی بە تەواوی بۆلای خۆی رادەکێشاو زۆربەی وتارەکانی سەرپێی بوون.

٧- زۆر دژی زوڵمو زۆرداری بوو. هەمیشە ئامۆژگاری سەرۆک عەشیرەتەکانی دەکرد واز لە چەوساندنەوەی جوتیارەکان بهێنن تاکو ئەوانیش ئازادو سەربەست بۆ خۆیان لە کوردستاندا بژین.

## کەموکورتیەکانی قازیمحەممەدو کاربەدەستەکانی

١- قازیمحەممەد وەکو پێویست شۆرشگێر نەبوو. هەمیشە دەیویست لە رێگای ئاینی ئیسلامو ئاشتیخوازانە بچێتە ناو ئیشوکاری سیاسیو عەسکەرییەوە کە ئەمەش هیچ کاتێ لەگەڵ بارودۆخی راپەرینی میللەتێکدا لە کاتێکدا کە داوای مافی رەوای خۆی بکات، ناگونجێت. دەبێ سەرکردەی بزوتنەوەیەکی نەتەوایەتی پێش هەموو شتێک شۆرشگێر بێت.

٢- قازیمحەممەد هەرێمایەتیو نەژادگەری بەکاردەهێناو خەڵکی مەهابادی دەخستە پێش هەموو کەسێکەوە کە ئەمەش بۆ سەرکردەی گەلێکی بەشخوراو و داگیرکراوی وەکو گەلی کورد ناگونجێتو زۆریش نارێکە.

٣- قازیمحەممەد زۆر توند نەبوو و وەکو ئەو سەرکردانەی کە زۆر باوەڕیان بەخۆیان هەیە، لە سەرڕای خۆی سوور نەبوو. زۆر جاران بە قسەی دەوروپشتەکانی دەکرد و بەبێ ئەوەی ڕێگای باشتری بۆ بدۆزێتەوە، ڕای خۆی دەگۆڕی.

٤ - سەبارەت بە کاروباری "کۆمار"و ڕێکو پێک کردنی زۆر ساردبوو. بۆ وێنە لە ماوەی ١١ مانگ تەمەنی کۆماردا یاسایەک (قانون) گەڵاڵە نەکرا کە لە ڕووی سوپایی، کۆمەڵایەتی، ئابووریو زانیاریەوە بەتەواوی پەیرەوی لێبکرێت.

٥- هەمیشە سیاسەتی چاوپۆشیو ڕازیکردنی خەڵکی بەکاردەهێناو پیاو خراپانو تاوانبارانی سەر بەئاغاو دەستەڵاتدارەکانی زۆر کەم پرسینەوەیان لەسەر هەبوو.

٦- لەلایەن حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەوە دەزگایەکی هەواڵگری تایبەتی لەناو کۆماردا وەک "ئەمنو ئیستخبارات"ی دروست نەکردبوو تاکو بتوانن هەموو هەستانو دانیشنو جوڵانەوەی خەڵک بخەنە ژێر چاوەدێری خۆیانەوەو خاینو موخلیس لە یەکتر جیا بکرێنەوە. لەوکاتەدا زۆر خەڵک بەناوی ئاغایەک یا کوێخایک تەزکیە دەکران، دەهاتن چەکیان وەردەگرتو لە ئەنجامدا چەکەکانیان دەبردو دەڕۆیشتن و نەدەهاتنەوە.

٧- زۆربەی زۆری ئاغاو کوێخاکانی چەکدار کە دەهاتن، بەروتبەو نیشانی سەبەرزی (ئیفتخاری)و هەریەک روتبەی "پۆڵکۆنێک" (عەقید)و یا "پۆد پۆڵکۆنیک" (موقەدم)یان دەدرایەو بەم روتبە روسیانە ڕێزیان لێدەگیرا. زۆریش لەوانە جلکی ئەفسەرییان بۆ خۆیان دەکریو روتبەکانیان دەخستە سەرشانی خۆیان کە ئەمەش دیسانەوە هەر بۆ ڕازیکردنی خەڵک بوو. ئەو روتبانەیان بە نووسراوێکی رەسمیو بە مۆری حەمەحوسێن خان وەزیری بەرگری بۆ منیش هێنا، بەڵام من نەمویست. چونکە ئەگەر وەرم گرتبایە، زۆر شەرمم لە خۆم دەکردەوەو هەر وەکو گاڵتەی مناڵانم سەیر دەکرد کەخەڵک لە خۆیەوە روتبە هەڵبگرێتو بکرێتە ئەفسەر.

٨ - نەقازی‌محەممەدو نەدەزگایەکەی حکومەتی کۆماری کوردستان لە مەهاباد بیریان لەوە نەکردبۆوە کە ئەگەر رۆژێ لە رۆژان هێرشێکی دڕندانەیان هاتە سەرو ناچاری بوون مەهابادو شارەکانی‌تری کوردستان بەجێ بهێڵن، چۆن خۆیان بگرنەوە. لەکام جێگا دابمەزرێن‌و ئەگەر لە پێشەوە بیریان لەوە کردبایەوە، دەبوایە لەو چیاو شاخە سەختانەی سەر سنووری عیراق چەند جێگایەک بۆ خۆیان دەستنیشان بکەن‌و رێکی‌بخەن تاکو لە کاتی تەنگانەدا یەکسەر بکشێنەوە ئەو شوێنانە و لەوێ شەڕی پارتیزانی دەست پێ‌بکەن.

٩- حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران وەکو پێویست لەناو چینەکانی خوتیارو کرێکاردا بۆ ئەوەی رێکیان‌بخات‌و بیانخاتە مەیدانی خەباتی شۆڕشگێرانەوە، کاری نەکردبو. هەموو حیزبێکی سیاسی ئەگەر بناغەیەکی توندو پتەوی لە ناو جەماهیردا نەبێت، هەرگیز ئەو حیزبە ناتوانێت لەبەر لافاوی سیاسی‌و عەسکەریدا خۆی رابگرێت.

ئەو کەموو کورتیانەی قازی‌محەممەدو هەڤاڵەکانی کەوا دەخەمە بەرچاوی خوێنەری خۆشەویست نموونەیەکی کەمەو ئەگەر راستیش قسەبکەین، دەبێ بڵێین زۆربەی تاوانی ئەم کەموکورتیانە دەکەوێتە سەر شانی قازی‌محەممەد. چونکە من ئاگاداربووم کە هەموو فەرمانەکانی سیاسی‌و عەسکەری درابووە دەستی خۆی‌و هەموو کەس لە عاستی بڕیارەکانی ئەودا ملکەچ بوو.

ئیتر ئەوەبوو باسی کۆماری مەهاباد لە ناو یادداشتەکانمداو ئومێدەوارم کە لە هەموو کەم‌و کورتیەکانم چاوبپۆشرێت‌و دەمەوێ هێندێکیش لە باسی بەسەرهات‌و ژیانی کۆمەڵایەتی خۆم بخەمە ناو یادداشتەکانمەوە.

## تێکچونم لەگەڵ باوکم و رۆیشتنم لە بێتاسە

پێشتر باسی ئەوەم کرد کە دوای هاتنەوەم لە مەهاباد، من هەر خەریکی ئیش‌وکاری ماڵ بووم‌و دانیشتبووم. لە هامان کاتیشدا بە نەهێنی لەگەڵ پارتیدا، پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق کە تازە دامەزرابوو، کارم دەکرد. چونکە هەر ئەو کاتەی کە لە مەهاباد گەڕامەوە، لیژنەی ناوچەی قەڵادزێ

پەیوەندیان لە گەڵ کردمو بووم بە ئەندامی پارتی. ئەو کاتە پارتی زۆر لاواز بوو. هەموو کەس حەزی نەدکرد کە بێتە ژێر ڕێکخستنی پارتی. ئەوەبوو لەگەڵ باوکم تێکچووموو داوام لێکرد ماڵم بۆ جیا بکاتەوە. من کە لە گەڵ باوکمدا تێک دەچووم، واتا ئەوەنەبوو کە خۆم لە عاستی فەرمانەکانی باوکمدا مل کەچ نەبم، بەڵام ئەوخۆی بە هیچ ڕازی نەدەبوو. چەند جار تکام لێدەکرد کە دابنیشێتو ژیانی ئاسایی خۆی بکات. ئێمەش خزمەتی دەکەینو پەکی هیچی ناخەین. بەڵام بە دانیشتن ڕازی نەدەبوو و هەموو ئیشوکارەکانی لێ تێکدەدایەوە. لەزستانی ساڵی ١٩٥٠دا ڕۆیشتمە لای مەحموود ئاغای هێرۆ کە هەم خزم بوو و هەم جیران، بۆ ئەوەی داوا لە باوکم بکات بەشە میراتی خۆم بداتێ. ئەویش گوتی باشە داوای لێدەکەمو ئەگەر ڕازیش نەبوو ئەوا من ماڵەکەت دەهێنمە لایخۆمو بژێیانو ئیدارەش خوا کەریمە. ئەوکاتە هەر مناڵێکم هەبوو و زۆر بە تەنگ ژیانەوە نەبوومو خۆشم قەناعەتی دەروونیم هەبوو. ئیتر هەرچی مەحموودئاغا بۆ جیاکردنەوەی میراتی ملکو ماڵ لەگەڵ باوکم هەوڵیدا، ڕازی نەبوو. مەبەستیشی هەر ئەوەبوو کەوا بە ناچاری لە گەڵیان دابنیشم. مەحموودئاغا ناردی مناڵەکانیان بۆ هێنامو ئەو زستانە لە هێرۆ مامەوەو هەرچەند کە مەحموود ئاغا زۆر هەوڵی لەگەڵدام کە یارمەتیو شتی لێوەربگرم، بەڵام لێم وەرنەگرتو پێم گوت تۆ مامی گەورەی ئێمەیو من بە بەشی تۆم شەرمم نیە، بەڵام نامەوێ هەر لە ئێستەوە خۆم فێری "موفتەیخۆری"و شتی بەلاش بکەم، بەڵکو دەمەوێ تەنیا باوەڕم لە سەر خۆم هەبێت. ئیتر ئەو زستانە هێندێ پارەم لە دۆستو برادەران قەرز کردو چەند فەردە توتنم پێ کڕین. ئەوساڵەش "نووری مەلا حکیم" لە قۆرخی (انحصاری) قەڵادزێ بە ڕێوەبەربوو. لە هەمان کاتیشدا سەرۆکی لێژنەی تاقیکردنەوە (فەحس)ی تووتن بوو. ناوبراو زۆر نیشتمانپەروەربوو. همیشە دەیویست ئیشوکاری خەباتکارانو نیشتمانپەروەران بەباشی ئەنجام بداتو لەکاتی خۆشیدا ئەفسەری سوپای عیراق بوو کە لە سەر کوردایەتی لە ڕیزی سوپا دەرکرابوو. ئەو وەجبە توتنەی بۆ فەحس کردمو لەکاتێکدا تووتنی خەڵک

لەدووەمو سێیەم زیاترنەبوون، هەمووی کردە یەکەمو ممتاز. هەردوای ئەوە وەجبەیەکی‌تریشم کڕی‌و ئەویشی بۆ فەحس کردم. بەوە پارەیەکی باشم هاتە دەستو ئەمەش بەهۆی نوری مەلا حکیمەوە بوو، خوا چاکەی بۆ بکات. چونکە لەکاتی تەنگانەدا زۆر یارمەتی دام، هەمیشە لە یادمە.

## ئاوەدان کردنی سێوەڵەو خەریک بوونم بەئیش‌وکار

لەساڵی ١٩٥٢ کە ئیستە ماڵم هەر لە هێرۆ بوو، داوام لە مەحموودئاغاو حەمەدئاغای هەباس‌ئاغا کرد کە بچنە لای باوکم کە بەڵکو هیچ نەبێت زەوی‌وزاری "سێوەڵەم" بداتێ تاخۆم ئاوەدانی بکەم. ئەوانیش گوتیان سێوەڵە زەوی‌و ئاوێکی وای لێ‌نیە تا تۆ خۆتی لەگەڵ ماندوو بکەی. گوتم هیچ نەبێ خۆمی پێوە خەریکدەکەم.

"سێوەڵە" کەوتبووە مابەینی "هێرۆ"و "بێتاسە"و نیوسەعات لە هێرۆوە دوور بوو. زەوی‌و زاری وای تێدانەبوو کە مرۆڤ پێی بژێت‌و هەمووی لە یەک دوو دۆنم زیاتر زەوی ئامادەکراوی لێ گیر نەدەکەوت. لە کارێزێکی کۆن زیاتر ئاوی کشت‌وکاڵی لێ‌نەبوو، ئەویش هەربەشی خواردنەوەی دەکرد. چەند پارچە مێرگێکی گیادروونی تێدا هەبوو کە بۆ تفاقی زستان دەدوراو لە دواییدا دەکرا بە مەڕ لەوەڕین‌و لە بەهارو پایزدا کەڵکی لێ‌وەردەگیرا. دارودرەختی خۆڕست وەکو درامازو و داربەڕوی زۆری لێ‌هەبوو کە ئەویش گوندەکانی جیران بەدزیەوە بۆ سوتاندن دەیانبڕین. بەهەرحاڵ چونکە باوکم هیچ واریداتێکی لە سێوەڵە دەست نەدکەوت، مەحموودئاغاو حەمەدئاغا توانیان باوکم رازی بکەن. من هەر ئەو ساڵە دەستم بەئیش کردو کارێزم بۆ ئاوی کشت‌و کاڵ لێدا، دارو بەردم دەرهێنان، مێرگم وشک کردنەوەو دەستم بە چاندنی رەزو باغی ئاوی‌و دێمی کرد. هەموو رۆژ لەهێرۆوە خەڵکم بۆ ئیش کردن نیوە بە پیاوەتی‌و بەلاش‌و نیوەش بەکرێ دەبرد. ئەو کاتە کرێکار زۆر هەرزان بوو، رۆژانە لە ١٥٠ فلس تێنەدەپەڕی. هەر ئەو ساڵە توانیم چەند پارچە زەوی بەپێوانەی ١٠تا١٢ دۆنم بۆ چاندنی توتن ئامادەبکەم. هەر ئەو زستانەش وەک زستانی

رابوردو دیسان به کڕین‌و فرۆشتنی توتن خەریک بوومەوەو زۆر قازانجم لێکرد. هێندێ‌جار مەحموود ئاغا توتنەکانی خۆشی هەر دەدایە من کە بۆی فەحس بکەم، چونکە دەیزانی لێژنەکان زیاتر یارمەتی من دەدەن. لەبەهاری ۱۹۵۳دا بڕیارم دا کە لە سێوەڵە خانووی زستانی دروست بکەم‌و نەگەڕێمەوە هێرۆ، چونکە باشتر دەمتوانی بە ئیشەکانم رابگەم. بەهەرحاڵ ئەو هاوینە خانوویەکی فەلاحی قوڕو بەردم پێکەوەناو چەند سەر مەڕو بزن‌و مانگاو گاجوتم هەبوون کە بەخێوکردنیان لەناو ئەو بەفرو سەرمایەدا هێندێ زەحمەت بوو. "ئاغەڵ"م بۆ ئەوانیش دروست کردو ئازوقەی چوار مانگی سەرماو سەهۆڵەی زستانم بۆ دانان. خەڵک زۆربەلایەوە سەیربوو کەمن بەتاکە ماڵە لە ناو ئەو هەموو بەفرەدا، ئەو زستانە لە سێوەڵە نیشتەجێ بووم. مەحموودئاغا زۆر لەسەر ئەوە سووربوو کە وەکو ساڵەکانی‌تر بگەڕێمەوە هێرۆ. بەڵام بەقسەم نەکردو مەبەستم زیاتر ئەوەبوو بە "ئارەقی" ناوچاوانی خۆم جێگاو ڕێگایەکی دایمی پەیدا بکەم تاکو لەداهاتوودا منداڵەکانم بزانن کە باوکیان بە چ ڕەنجێک ئەو جێگاو ڕێگایەی دروستکردوەو بە زۆرو زۆرداری لەهیچکەسی نەبڕیوە. زۆر شەوان مەحموودئاغا دەینارد بە شوێنم داو بەیەکەوە گوێمان لە رادیۆ دەگرت. لە دەوراوپشتی ئێمە هەر ئەو رادیۆی هەبوو. ئەو شەوانەی کە لای مەحموودئاغا دەمامەوە، هەرچەند کە خۆشم شوان‌و ڕەنجبەرم هەبوون، خۆی یەک دوو پیاوی خۆی بۆ وریایی‌و ئیشکچیەتی ماڵەکەمان بۆسێوەڵە دەنارد. نێوانمان لەگەڵ مەحموود ئاغا زۆر خۆشبوو، هەرگیز ئەو خزمە بەڕێزەم لەیاد ناچێت. من لەکاتی زستاندا زۆر لەماڵ دەمامەوە، چونکە لەبەر سەرمای زۆرو بەفر ڕێگای دەرەوەم نەبوو، زیاتر خۆم بەخوێندنەوەی کتێب‌و شت دەخافڵاندو لەدواییدا رادیۆییەکی جۆری "Cird" بە باتری وشکم پەیدا کردو بەوە توانیم بۆشایی دانیشتن پڕکەمەوەو هەموو گرێی دەروونیم لابەرم. بابەکری کوڕی مەحموودئاغاش زۆر یارمەتی دەدام. هەر کتێبێکی خۆش‌و تازە کە دەردەچوون، سیاسی، ئابووری‌و کۆمەڵایەتی لەبەغداوە بۆی دەناردم. ئەو کاتە لەبەغدا دەیخوێند. کوڕەکانی مەحموودئاغا زۆر منیان خۆش دەویست‌و کاتی

پشودانی قوتابخانه زۆربەی کاتی خۆیان لای من رادەبوارد. ئەگەر کاتی ئیش کردن بووبایە، هەریەکەی "بێڵێک" واتە خاکنازێکم دەدانەدەستو دەمگوت ئیش بکەن، ئەگینا نان خواردن نیەو دەبێ دروشمی "من لا یعمل لایأکل" ئەنجام بدرێتو ئەوانیش بەپێی توانای خۆیان ئیشیان دەکردو ئەوسا بۆ نان خواردن دەهاتینەوەماڵەوەو بەگاڵتەو قسەی خۆش رامان‌دەبواردو نەماندەزانی داخوا "دەوری کام پاشایە". سەد ئاخ بۆ ئەو زەمانانە کە چەند خۆش بوو، مرۆڤ چۆن وا بەئازادیو سەربەستی دەژیا. هەرچەند کە پلەی ئابووری وەکو ئێستاکە بەرز نەبوو، بەڵام دونیای ئەو زەمان وەکو ئێستاکە ئاڵۆزاوی باری سیاسیو گیرۆدەی "مادە"و تەماعکاری نەبوو، هیچ کەس وەکو ئیمڕۆ بۆ پارە پەیداکردن رق بەرقەی نەدەکرد.

## هەڵبژاردن (ئینتخابات) بۆ مجلسی نیابی لە پشدەرو بەربەرەکانی مەحموودئاغا لەگەڵ بابەکرئاغا

لە هەموو ئەو دەورانەی هەڵبژاردندا بۆ "پەرلەمان" هیچکاتێ بە پێی دەنگدان ئەندامی پەرلەمان لە پشدەر دانەدندرا. تەنیا هەر بابەکرئاغا خۆی یەکێکی لەخزمو کەسو کاری خۆی دەستنیشان دەکردو حکومەتیش پێی‌رازی دەبوو. تا ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٥٤ مەحموودئاغا بریاری‌دا کە چیتر رێگا بە بابەکر ئاغا نەدات بەم شێوەیە راو ئیرادەی خۆی لە پشدەر فەرز بکات. چەندجار خۆی چوو بۆ بەغداو کارێکی وای‌کرد کە چیتر بە قسەی بابەکرئاغا نەکرێتو بۆ ئەنجوومەنی نیابی هەڵبژاردن لە ناوچەی پشدەردا دەست پێ‌بکرێت. ئینجا مەحموودئاغا خۆی منی دەستنیشان کرد کە خۆم بپاڵێومو ئەویش دەنگم بۆ پەیدا بکات. ئەو ئەوەشی دەزانی کە من لەلایەن پارتی‌یەوە دەنگم زۆر دەبێتو خەڵکی ناوشاری قەڵادزێ، ئەوەی ئەندامی پارتیش نەبوون، دەنگیان دەدامێ. لە ئەنجامدا حکومەت لە بریاری خۆی پەشیوان بۆوەو رێگای نەدا هەڵبژاردنی راستەوخۆ بکرێت. لەجیاتی هەڵبژاردن بریاریان‌دا لە نێوان چەند پاڵێوراودا تیروپشک بکرێت کە ئەوانیش دەبوو لەلایەن بابەکرئاغاو

مەحموودئاغاوە دەستنیشان کرابان. دەبوویایە ناوی ئەم پاڵێوراوانە بخرابانە ناو "تورەکە"و یەکەم ناوی کە رادەکێشرا، دەبوو بە "تایب"و ئەوانیتر هیچ.

مەحموودئاغا زۆر حەزی کرد منیش ناوی خۆم بخەمە ناو تورەکەوە، بەڵام رازی نەبووم‌و زۆر بە عەیبیشم دەزانی کە پیاوێکی زرت‌و زەلام بەبی ئەوەی میللەت پێی رازی بێت، بە هۆی کیسەوە بکرێتە نوێنەری پەرلەمان. ئەوەبوو "عومەری خدرئاغا"ی برازای مەحموودئاغا لە "تورەکەوە" هاتە دەرەوەو کرا بە نوێنەرو رای بابەکرئاغا وەکو ساڵانی رابوردو وەرنەگیرا. لەوەدا بابەکرئاغا بۆی دەرکەوت کەوا مەحمود ئاغا لەلایەن حکومەتی عیراقەوە مەرکەزیەتی هەیەو گوێ لە قسەی دەگرن. ئەوەی راستی بێت مەحموودئاغا نەک هەر لای حکومەتی عیراق جێگای خۆی کردبۆوە، بەڵکو حکومەتی ئێرانیش زۆر بە چاوی رێزەوە سەیری دەکردو زۆرجار وا رێدەکەوت نوێنەرانی هەردوو حکومەتی عیراق‌و ئێران بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی مابەینی خۆیان لە ماڵی مەحموودئاغا کۆببنەوەو زۆرجاریش وادەبوو کە مەحموودئاغا منی بۆ جێبەجێکردنی ئیش‌و کارەکانی عەشایری پشدەر دەربارەی زەوی‌وزارو مەرلەوەڕێن (مەرتەع) لە ناو خاکی ئێراندا دەناردە سەردەشت. چونکە وەک پێشتر باسمان کرد، خەڵکی پشدەر لەهاویندا دەچوونە ناوخاکی ئێرانەوەو تا ماوەی سێ‌چوار مانگ دەمانەوە.

## سەرەتای تێکچوونی وەزعی پشدەر

لە ساڵی ١٩٥٤و ١٩٥٥ کاتێ حکومەتی نوری سەعید بۆی دەرکەوت دووبەرەکی‌و ناخۆشی بە شێوەیەکی فراوان کەوتۆتە مابەینی سەرۆکەکانی پشدەر (بابەکرئاغاو مەحموودئاغا)و ئەو یەکیەتی‌و رێکیەتیەی کە جاران هەبوو لە ناو عەشیرەتی پشدەردا نەماوە، بە هەلی زانی دەستی خۆی بخاتە ناویان‌و کەڵک لەم دووبەرەکیە وەربگرێت. ئەوەبوو ئەفسەرێکی عەسکەری پلەی عمیدروکن بە ناوی "عومەر عەلی" کردە پارێزگاری سلێمانی‌و هەموو دەسەڵاتێکی بەڕێوەبەرایەتی‌و سیاسی پێدا تاکو بتوانێت عەشیرەتی پشدەر لەم

هەلو مەرجەدا وەکو هەموو ناوچەکانیتری کوردستان بهێنێتە ژێر باری یاساوە. ئەوەبوو یەکەمجار عومەرعەلی خۆی هاتە پشدەرو سەری لە ماڵی هەردوو سەرۆکەکانداو داوای لێکردن کە رازیبن "دایرەی تەجنید" بیتە پشدەرو بۆ مەبەستی نەهێشتنی کێشەی زەویزار، یاسای تەسویەی زەویوزاریش لە ناوچەکەدا بکەویتە کار. سەرۆکە ناوبراواوەکان بەهۆی ناکۆکیو دووبەرەکی خۆیانەوە، لە کاتێکدا دەیانزانی ئەمە کارێکی خراپەو دەبێتە هۆی شکستی پشدەر، بە هەردوو داوایەکانی "عومەرعەلی" رازی بوون. خەڵکی ناوچەی پشدەر هەرگیز نەیاندەویست بچنە ژێر یاسای "تەجنید"و خزمەتی ئاڵای حکومەتی عیراق بکەنو ئازادیو سەربەخۆییان لێبسرێتریتەوە، بەڵام چارە نەبوو، دەبوایە مل بۆ هەموو یاسایەک رابکێشن. دەست بە گرتنی سەربازی ئیجباری کراو یاسای ئەسویەش کەوتە جێبەجێکردن. ئەم یاسایە نەک هەر کێشەی کەم نەکردەوە، بەڵکو تۆوی دووبەرەکیو دوژمنایەتی لە ناو خەڵکی پشدەردا بە جووتیارو خاوەن زەوییەوە زۆر زیادکردو ئەو گوندانەی ئەم یاسایەیان تێدا جارڕدابوو، کەوتنە دژایەتی یەکترو یەکپارچە دووبەرەکیو ئاژاوە دروستبوو. حیزبی شیوعی عیراقیش دەرگای بۆ کرایەوە کە بە هاندانی جووتیارەکان لە دژی خاوەن زەویوزار ئاگری دووبەرەکیەکە زیاتر خۆشبکات. هێندێ لە مەلایەکانیش کە بە ناو مەلابوونو لە ژێرەوە ببوونە شیوعی، فتوایەکی ناشەرعیان بە نهێنی بۆ جووتیارەکاندا کە ئەگەر لەسەر زەویوزاری ئاغایەکان بەدرۆ سوێندیش بخۆن، دروستەو شەرعەن هیچ گوناهی تێدانییە. ئەمجا وای لێهات هیچکەس ترسی لە سوێندو قورئان نەماو بە راستو درۆ سوێندو تەڵاقیان دەخواردو ئایینو ویجدان خرایە ئەو لاوە. ئەوجار حکومەتی عیراق کەوتە سەرباری خۆیو ویستی چەند یاسایکیتریش بەسەر خەڵکی ناوچەکەدا فەرزبکات. وەکو قەدەغەکردنی چەک لەشارو دێهاتەکانو هەروەها تاقیبکردنی تاوانباران (موتەهەمین) بە شێوەیەکی زۆر توند. تەنانەت داوای لە سەرۆکەکانی پشدەر کرد کە دەبێ خۆیان "موتەهەمەکان" واتە ئەوانەی کە لە زەمانی کۆنەوە ئەوراقیان لە دەوایری

حکومیدا هەبووە، بەدەستەوە بدەن. بابەکرئاغا خۆی ناچاربوو چەند خزمو کەسوکاری خۆی بباتە سلێمانیو بیاندات بە دەستەوە. ئەمجا لەم کاتە ناهەموارو ناڕێکیەدا کە ناوچەی پشدەر پێویستی بە کەسانی زاناو زیرەک هەبوو، بۆ ئەوەی چارەیەک بۆ ڕێکخستنی عەشیرەتی پشدەر بدۆزنەوە، تاکو ڕێگا نەدەن لەمە زیاتر ڕژێمی پاشایەتی عیراق گاڵتە بە توانای ئەو عەشیرەتە بکات. هەر لەو کاتە ناسکەدا لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٥٦دا مەحموودئاغای هێرۆ تووشی نەخۆشی کتوپڕی "جەڵتەی" دەماغ بوو. لە گوندی سندۆڵان کە بە میوانی ڕۆیشتبوو بۆ ئەوێ کۆچی دوایی کردو غەمو پەژارەی نەک هەر بۆ کەس‌وکاری خۆی، بەڵکو بۆ زۆربەی خەڵکی ناوچەکەی بەجێ‌هێشت. هەروەکو من ئاگادارم ئەو بەم نیازە هاتبووە خوار بۆ ناو خزمو خزمایەتی کە بەڵکو هیچ نەبێت بۆ ڕێکیو ئاشتی لە مابەینی خۆیو بابەکرئاغاداو هەروەها لە مابەینی جووتیارو ئاغایەکاندا هەوڵێک بدات، بەڵام بەداخەوە نەگەیشتو ڕۆژی تەواو بوو.

## گرفتاربوونم بە کێشەی تەسوییە

شەڕو ئاژاوەی پشدەر وای لێهات کە هەموو کەسێکی گرتەوەو تا من خۆم کە لای خەڵک بە ئاشتیخواز دەناسرامو بەبیرمدا نەدەهات ڕۆژێ لە ڕۆژان زەویوزاری کەسێکم زەوت کردبێت، تەنیا هەر ئەوەندە زەویەم هەبوو کە ئەویش بە ئارەقی ناوچاوانی خۆم پەیدام کردبوو. لەگەڵ ئەوەشا تەمەشام کرد هاندانی حیزبی شیوعی لە دژی منیش هەیەو دەیانەوێ بەو بیانووە کە ناوی ئاغایەتیم لەسەرە، ئەو گوندانەی دەوراوپشتی خۆم لێ‌هان‌بدەن. چونکە حیزبی شیوعی ئەو کاتە بێ ئەوەی بزانن داخوا ئەم ئاغایانە ئیش‌و کاریان ئاغایەتیە یا هەژارنو هەر ناویان ئاغایە، دروشمی ئەوەبوو کە دەبێ ناوی ئاغا نەمێنێ.

ڕۆژێک سەرلەبەیانی زوو کە لە خەو هەستام، سەیرم کرد وا نیزیکەی شەست تا حەفتا جووت هاتوونە سەر زەویەکانمو خەریکی داچاندنی زەویەکاننو چەکدارێکی زۆریشیان لەسەر شاخەکانی دەوراوپشتم بە نیازی

شەڕکردن دامەزراندووەو هێندێکشیان بە تەورو داسەوە بەربوونەتە داربڕینو ئەو هەموو دارمازووە بەرگرە زۆر بەسوودەی کە چەند ساڵ بوو بۆ ئەوەی "مازووی" باش بگرن کەس نەیدەبڕین.

ئەم خەڵکانەی کە حیزبی شیوعی هانیدابوون مەبەستیان ئەوەبوو لە گوندی سێوەڵەم دەربکەنو هاندەری ئەساسیش لەلایەن حیزبی شیوعیەوە چەند کەسانێکی دیارو ناسراوبوون کە لە قەڵادزێ دادەنیشتنو لەوانە هەباسی سۆفی رەسوڵی "بێکڵۆی"، حاجی شیرخۆری "هەڵشوێ"و لەتیف خاڵە هەباس "گەناو" بوونو ئەوانە لەلایەن میریشەوە پشتیوانیان لێدەکرا. بەهەرحاڵ من ویستم یەکەمجار نەرمیو خوێنساردیان لەگەڵدا بەکاربهێنمو زۆر تکام لێکردن کە بەڵکو وازم لێبهێننو شەڕم پێنەفرۆشن. بەڵام هەرچی لەگەڵیاندا گوتم بێسوود بوو.

هیچ چارەم نەما لەوە زیاتر کەوا لەم دوو ڕێگایە یەکێکیان هەڵبژێرم. یا ڕۆیشتن لە سێوەڵەو یا شەڕکردن کە ئەویش شەڕی مانو نەمانە. من تەنیا دوو چەکدارم لا هەبوو، بە خۆمەوە دەبووین بە سێ کەس. ئەو دووانە یەکێکیان حەسەنی برام بوو کە ئەو کاتە لە تەمەنی ١٤ تا ١٥ ساڵی دابوو. ئێمە پاش لێکدانەوە، ڕێگای دووەممان هەڵبژارد کە ئەویش خۆبەکوشتدان (ئینتحار) بوو. لەگەڵ ئەوەشا مردنو فەوتانم لە ژیانی سەرشۆڕ و بێکەرامەتی لا خۆشتر بوو. ئیتر حەسەنی برام نارده سەر ئاخیرین لووتکەی چیای گردە بێناسو ڕامسپارد لەوێوە چەند تەقەیەک بکاتو چەند گاجووتیان لێیبکوژێت. بەڵام تا دەتوانێت زەلامو جووتیارەکان لە کوشتن بپارێزێت. منیش لەگەڵ زەلامە چەکدارەکەی لای خۆم لە نیزیکی ماڵەکەمان دامەزراینو سەنگەری شەڕمان دروست کرد. ئەوەبوو حەسەن دەستی بە تەقە کرد. دیتم جووتیارەکان ڕایانکردو گاجووتەکانیان بە "نیروئامورر"ەوە بەرهەڵداکرد. وەکو قازی سەرلێشێواو نەیاندەزانی چی بکەنو چەکدارەکانیشیان پاش چەند تەقەیەکی بێسەروبەر جێگاکانی خۆیان بەردا و هەڵاتن. ئەمەش بێگومان هەر لە خواوە بوو کە بە لوتفی خۆی هاریکاری ئێمەی کرد، چونکە ئێمە لەسەر

حەق بووین. ئەگینا چۆن ئەو هەموو خەڵکە چەکدارو بێچەکە بە هێزی سێ نەفەرو لە ترسی چەند تەقەیەک رادەکەن؟ ئێمە وامان‌دەزانی هەر لە یەکەم تەقەدا هێرشمان بۆ دەهێنن‌و ماڵەکەشمان ئاگر دەدەن. ئەوەبوو خوا رزگاری کردین‌و دەوراوپشتی ماڵەکەمان چۆڵکراو کەسیشمان لە دەست نەکوژرا.

زۆری نەخایاند کە ئامرمەخفەری شورتەی هێرۆ بەخۆی‌و چەند پۆلیسێکەوە بەتەقەکانەوە هاتن‌و لە دوای پرسیارو سەیرکردنی جێگاکان بۆیان دەرکەوت مەسەلە چی‌یەو ئەوانە بەنابەحەق هاتوونەتە سەر ئێمەو راپۆرتی خۆیان وەکو بەیانی راستی، بۆ مەرکەزی قەزا نووسی. منیش ناوی چەند تاوانبارێکی ئەساسیم‌دا بە دایرەی شرطەو هەموومان بۆ قەڵادزێ داواکراین. ئەوکاتە معاونی مەرکەزی شورتەی قەڵادزێ "تاهیر نایلۆن" بوو کە زۆر لایەنگیری پارتی‌و برادەری خۆشم بوو. پاش رێکخستنی "ئەوراقی تەحقیقی"، حاکم بریاری گرتنی ئەو کەسانەی دەرکرد کە دەستدرێژیان کردبووە سەرمان‌و هەروەها ئەو هاندەرانەی کەوا لە سەرەوەش ناوم بردن(هەباسی سۆفی رەسوڵ‌و حاجی برایم شیرخۆر) خەڵکیان بۆ ئاژاوەگێری هان‌دەدا، دەسگیر کران. بە هەموویە دوازدە کەس لە خەڵکی گوندەکان، لەپێش هەموویانەوە "هێرۆییەکان"و دووکەسیش لەئاژاوەچی‌و هاندەرەکانی دانیشتوی شاری قەڵادزێ، بەپێی بریاری حاکم خرانە بەندیخانەوە. پاش یەک‌دوو رۆژ قایمقامی قەزا ئەوراقەکانی لەدادگاوە کشاندەوە لای خۆی‌و دیاربوو لەسەرەوە فەرمانیان پێداوە ئەم کێشەیە بەیاسای ئیدارە چارەسەربکات. پاش دادگا کردنمان لە ئیدارە، قایمقام وەکو تاوانبارەکانی‌تر بریاری بەندکردنی منیشی‌دا کە ئەمەش لە هەموو یاسایەک بەدوور بوو. بەهەرحاڵ تاهیرمعاون دیسان یارمەتی دام‌و ژوورێکی تایبەتی وەکو دیوەخانەی جیاواز لە بەندیخانەی پێدام‌و هەموو کەلوپەلی پێویستیم بۆ دەهات. ژوورەکەمان رۆژانە لەبەر میوانانی ئاغا مۆنجی دەدا. من‌و حەسەنی برام بۆ ماوەی چوارپێنج رۆژ لە بەندیخانەی رواڵەتی ماینەوەو لەئەنجامدا تاوانبارەکان خۆیان لە بەندیخانەدا تەنگاو بوون‌و بەو مەرجەی کە جارێکی‌تر تاوانی وا نەکەنەوەو واز لە خراپە بهێنن، داوای

ڕێککەوتنیان کرد. منیش ڕازیبووم‌و هەموومان بەرهەڵداکراین‌و کۆتایی بەکێشەکەمان هات‌و ببڕاوببڕا جارێکی‌تر شەڕمان پێ نەفرۆشرایەوە. ئەوکاتە قایمقامی قەڵادزێ کانەبی عەزیزدەزە ی بوو. ئەویش هەر لایەنگری پارتی بوو.

## کێشەی تەسویە لەگوندی بێناسە

هەرچەندە من سەبارەت بە گوندی سێوەڵە هیچ کێشەم لەگەڵ گوندەکانی دەوروپشتم نەماو گیروگرفتەکانم کۆتاییان پێهات. بەڵام خەڵکی گوندی بێناسە دیسان بە هاندانی حیزبی شیوعی لەگەڵ باوکم‌و مامم لەسەر زەوی‌وزار کەوتنە کێشەو بوو بەهۆی جاڕدانی تەسویە لە گوندی بێناسە. من یەکەم‌جار وەکو کەسێکی بێلایەن چوومە ناو ئیشەکەو ویستم کەوا بەرێگای ئاشتی‌دا بچین‌و هیچ کێشەی لێ‌پەیدا نەبێت. هەردوو لایان دان بەمافی یەکتردا بنێن تاکو یاسای تەسوییە بەبێ گیرو گرفت ئیشی خۆی بکات‌و هیچ لایەک تووشی خەرجی دادگاو گرتنی پارێزەر نەبین. خەڵکی گوندەکە خۆیان وەکو ئاغایەکان زەوی‌و ڕەزو باغیان هەبوو. کەسیش دژی ئەوە نەبوو کە ئەم خەڵکانە خاوەنی مافی خۆیانن. بەڵام هاندانی شیوعیەکان کارێکی وای نەکردبوو کە وا بەئاسانی ئەو خەڵکە بەقسەی من بکات. ئەوەبوو خەڵکەکە داوای خۆیان لەسەر زەوی‌وزاری ئاغایەکان واتە باوکم‌و مامم تۆمارکردو منیش ناچاربووم کە دیسان بکەومەوە ناوکێشەو دەردی سەری. چونکە نە باوکم‌و نە مامم هیچ شارەزاییان لە دەوایری میری‌و مەسایلی تەسویدا نەبوو. ئێمە مسعودمحەممەدمان کردەپارێزەری خۆمان‌و خەڵکی گوندەکەش ئیبراهیم ئەحمەدو عەونی یووسفیان کردنە پارێزەری خۆیان. مەسەلەکە لە قۆناغی "مەسح‌و کەشفەوە" گەیەشتە دادگاو ئێمە چەندکەس شاهیدی خۆجێی‌مان هەبوو کەشاهیدی ڕێکوپێکیان‌دا لەسەر ئەوەی کەئاغایانی بێناسە هەمووساڵێک بێ زۆرو زۆرداری "مڵکانە"یان لە هەموو خەڵکی ئەو گوندە وەرگرتوە. ئێمە لەو گوندەدا هەر تەنیا زەکاتی شەرعی لە ١٠% مان لەو زەوی‌و زارانەی کە

خەڵکەکە خۆیان هەیانبوو وەردەگرت. بەڵام خاوەن داواکانی ئێمە بۆیان ئیسبات نەکرا کە ئەوان خاوەنی مافی شەرعینو ئیتر ئەو زەویو زارەی کە لە گوندی بێناسەدا ئەوانیشو ئێمەش هەمانبوو، هەمووی لەسەرباوکمو مامم تۆمار کرا. لەقۆناغەکانی "تەمیز و ئیستئنافیش"دا هەر نەیانتوانی سەربکەونو کێشەکە کۆتای پێهاتو تاپۆی رەش وەرگیرا. ئەوجا خەڵکەکە هەموویان پەشیوان بوونەوەو دانیان بەوە داهێنا کە ئەوان لەسەر هەڵە رۆیشتوونو حیزبی شیوعی تووشی ئەو هەڵەیەی کردون. ئێمەش کە وامان دیت، نەمانویست لە رێگای ئاینی ئیسلام لابدەینو وجدانی خۆمان بخەینە ژێرپێو هەموو زەوی وزارەکانیان کە لە سەر باوکمو مامم تاپۆ کرابوون، خستمانەوە ژێر دەستەڵاتی خۆیانو خەرجو سەرفیاتی دادگاشمان پێنەبژاردنەوە. ئەوەی راستی بێت، مامم حەمەئاغا بەوبڕیارە رازینەبوو، بەڵام لە ئەنجامدا چارەی نەماو ئەویش هەموو زەویەکانی جوتیارەکانی واز لێهێنان.

## هاتنی بازێ لە گەنجەکانی ئاغای پشدەر بۆ ناو پارتی

پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە حیزبی شیوعی هەمیشە جووتیارەکانی لە دژی ئاغاو خاوەنزەوی هاندەداو کێشەو نیزاع گەیشتبووە ئەوپەڕی توندی. بەپێچەوانەوە پارتی دیموکراتی کوردستان زۆر حەزی لە هێمنیو ئاسایش دەکردو نەدەویست جوتیارو خاوەنمولک بکەونەوە کێشەو بەربەرەکانی یەکترو ئاژاوە بکەوێتەوە ناو کوردستانەوە. هەڵوێستی پارتی گەیەشتبووە ئەو رادەیە کە شیوعیەکان پارتیان بە کۆنەپەرستو ئیستعماری تاوانبار دەکرد. هەر لەو کاتانەشدا هەمزە عەبدوڵلا کە سکرتێری پارتی بوو، زۆرهاتو چۆی ناوچەی رانیەی دەکردو سەریشی لەماڵی هەباسی مامەند ئاغا دەدا. جارێک بە رێکەوت چەند ئاغایەکی پشدەری کە بەمیوانی دەچنە ماڵی هەباسئاغا چاویان بە هەمزە عەبدوڵلا دەکەوێتو لەقسەو هەڵوێستی زۆر رازی دەبنو ئەویش پێشنیاری کردبوون کۆمەڵێک لە گەنجەکانی پشدەر بێنە ناو رێزی رێکخستنی پارتیەوە، بۆ ئەوەی پارتیش بتوانێ پارێزگاریان لێبکاتو ماوە نەدات چیتر

حیزبی شیوعی دژایەتیان بکات. ئەوانیش بەم پێشنیارە زۆر رازی بوون و بریاریان دابوو کە لقێکی پارتی بە ناوی عەشایر لەهەردوو ناوچەی رانیەو پشدەردا بکرێتەوەو ناوی بنرێت "لقی پارتی عەشایر"و بۆ ئەو مەبەستەش ناوی منیان دابوو کە ئەو لقە رێکبخەمو وەکو لێپرسراو سەرپەرشتی بکەم. من هیچ ئاگاداریم لەو بریارو شتانە نەبوو، تا ئاگاداری مامۆستا هەمزەم کرد کە خۆی بە نهێنی بێتە ناوچەی پشدەر تاکو لەشێوەی رێکخستنیان تێبگەم. ناوبراو بە دەنگمەوە هات و لەگوندی "گوێزیلە" لە ماڵی مامەندی حاجی خدرئاغا کۆبوونەوەیەکی فراوانمان کردو کۆمەڵێکی باش لە گەنجەکان لەم کۆبوونەوەدا بەشداربوون. کۆبونەوەکەمان زۆر بە نهێنی گرتبوو، چونکە لە دەوری رژێمی پاشایەتیدا ماوە بەخەباتی نهێنی لە دژی رژێم نەدەدرا. لەساڵی ١٩٥٧ دابوو لەم کۆبونەوەیەدا هەمزە عەبدوڵڵا بە شێوەیەکی گشتی دەستی بە شیکردنەوەی بارودۆخی سیاسی کوردستان کردو هەروەها وەزعی ناوچەکانی رانیەو پشدەری بەتایبەتی شی کردەوەو تێیگەیاندن کە پارتی هیچکاتێ حەز بە ئاژاوەو شێواندنی نێوانی جوتیارو خاوەنموڵک ناکات. بە تایبەتی لە قۆناغەی ئێستادا کە خەباتی چینایەتی لە سوودی گەلی کورد نیە. لە ئەنجامدا بریار درا ئەم ئاغایانەی خوارە ببن بەئەندامو کارگێری "لقی عەشایر" لە ناوچەی پشدەرداو منش ببم بەلێپرسراوی ئەم لقە.

## ناوی ئەندامەکان:

١- حەمەی هەباسئاغای (چۆم خڕکە)

٢- هەمزەی باپیرئاغای (گردسپیان)

٣- حاجی مەحموودئاغای (هێرۆ)

٤- بابەکری باپیرئاغای (نورەدین)

٥- ئەحمەدی حاجی هەباسئاغای (شڵەمرە)

٦- خدری بابکرئاغای (دێگە)

٧- مامەندی سەلیمئاغای (سەرکەبکان)

٨- مامەندی مینا ئاغای (گردبداغ)

٩- عومەری سەلیم‌ئاغای (سەرکەبکان)

١٠- مامەندی خدر ئاغای (گوێزیلە) ١١

١١- سەلیمی مەحموود ئاغای (بادەڵیان)

١٢- ئەحمەدی بابەکرئاغای (گردسپیان)

١٣- حمەی کانەبی‌ئاغای (بناویلە)

ئیتر بەم شێوە ڕێکخرانو هەموو سەرەمانگ کۆبوونەوە دەکراو پارەی مانگانەش ئابوونەی حیزب کۆ دەکرایەوەو دەناردرا بۆ لقی ٤ی پارتی لە سلێمانی کە ئەوکاتە "نووری ئەحمەد تەها" لێپرسراوی لق بوو. کۆبوونەوەکانمان زۆر بەنهێنی دەکردو هەرجارە لەماڵی یەکێک لە ئەندامەکان بەناوی دیدەنیو سەردان کۆدەبوونەوە. چونکە جگەلەم ترسە کە لە میری هەمانبوو، ترسمان لە بابەکرئاغاش هەبوو. بابەکرئاغا تاکە سەرۆکی پشدەر بوو ئەوە کاتەو هەرگیز بەوە ڕازی نەدەبوو کەخەباتی نهێنیو ڕێکخستنی پارتی لەناوچەی پشدەردا بە ناوی ئاغایەکان بکرێت. ڕاستی من خۆم زۆر لەگەڵیان ماندوکردو ئیشوکاری خۆم لەپێناوی فێرکردنو ڕێکخستنیاندا دەفەوتاند. فێرکردن واتە فێرکردنی کوردایەتی. من وام دەزانی کە ئەو گەنجە خوێنگەرمانە بە نیازی پارتایەتی هاتوونەتە ناوریزی ڕێکخستنو ڕۆڵێکی زۆر گرنگ لە ناوچەی پشدەر یاری‌دەکەنو بەوهیوایە بووم هەرچی زووتر دەگەنە لوتکەی سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کورستان. کێ هەیە کە سەربەرزی خزمو کەسوکاری خۆی پێ خۆش نەبێت؟

## ئینقلابی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨و هاتنەوەی مەلامستەفای بارزانی لەروسیا

هەرچەندە بەرواڵەت وادیاربوو بناغەی رژیمی پاشایەتی لەعیراقدا زۆر پتەو دامەزراوەو لەلایەن دەوڵەتانی رۆژئاواوە پشتیوانی لێدەکرا، بەڵام لەناوەوەی عیراقدا حیزبە سیاسیەکان بەتێکرایی دژی رژێم وەستابوون‌و لەژێرەوە بەرەیان پێکهێنابوو. هەرچەند ئەوکاتە پلەی سیاسی پارتی ئەوەندە بەرز نەبوو کە حیزبەکانی‌تری عیراق دانی پێدابێنن‌و لەریزی بەرە(جبهە)ی نیشتمانیدا وەری‌بگرن، بەڵام پارتی دیموکراتی کوردستانیش یەکێک بوو لەو حیزبە سیاسیانە. لە رۆژی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ ئینقلابێکی عەسکەری لەبغدا رووی‌داو رژێمی پاسایەتی لەناوچو. کۆماری عیراق جاڕدراو سەرۆکی ئینقلابەکە عەبدولکەریم قاسم کەخۆی هەر لەپێشەوە بەناوی ئەفسەرانی‌ئازاد لەگەڵ حیزیە سیاسیەکاندا پەیوەندی هەبوو، هاتە سەرحوکم‌و خۆی کردە سەرۆکی وەزیرانی عیراق‌و رێگای بە مەلا مستەفادا کە پاش ١٣ ساڵ دەربەدەری، لەخاکی روسیا بگەڕێتەوە نیشتمانی خۆشەویست. گەلی عیراق بەگشتی زۆر خۆشحاڵی خۆیان بۆ هاتنەوەی مەلامستەفا دەربڕی‌و لە لایەن هەموو چین‌و دەستەکانی عیراق بە کوردو عەرەبەوە پێشوازیەکی گەرمیشی لێکرا. مەلامستەفا یەکەم‌جار هەر خۆی‌و میرحاج‌و ئەسعەد خۆشڤی هاتنەوەو مەلامستەفا لەرێگا لەقاهیرە چاوی بە "جەمال عەبدولناسر" کەوتبوو. لەدوایشدا هەموو بارزانیەکان لە روسیا گەڕانەوە. کاتێ مەلامستەفا هاتەوە، عەبدولکەریم‌قاسم زۆر رێزی لێ‌گرت‌و لە ئوتێلی "سمیرامیس" کە ئەوکاتە ئوتێلی دەرەجەیەک بوو، دایانبەزاندو دەستە دەستە ئەحزابی سیاسی عیراق‌و هەروەها خەڵکی کوردستان دەهاتنە بەخێرهاتنی. مەلامستەفا لە هەموو وتارەکانیدا هەر دەیگوت من سەربازی عەبدولکەریم قاسمم‌و دەیویست بیروباوەری عەبدولکەریم بۆلای خۆی رابکێشێت. حیزبی شیرعی عراقیش کە ئەو کاتە زۆر بەهێز بوو و ئەندام‌و لایەنگیرێکی زۆری هەبوو، وای‌دەزانی کە مالامستەفا دوای ١٣ ساڵ مانەوە لە یەکێتی سۆڤیەت بۆتە شیوعی‌و بە

بیروباوەڕی مارکسیەوە گەڕاوەتەوە عیراق. بەڵام لەپاش چەندرۆژێک دەرکەوت کە مەلامستەفا نەک هەر شیوعی نییە، بەڵکو زۆریش دژی شیوعیەتەو هەر بەئاشکرا دەستی کرد بە پروپاگندەو ناووناتۆرەی خراپی لێدەنانو دەیگوت حیزبی شیوعی خاینی نیشتمانو نۆکەری دەررەوەیە. ئەو کاتەی مەلامستەفا هاتەوە، دەوری حیزبی شیوعی لە کوردستاندا زۆر لەجاران خراپر بوو، بەوئینقلابەی عەبدولکەریم قاسم هەر بە تەواوی هەڵچوونو وایان دەزانی خۆیان ئەو ئینقلابەیان سەرخستووە. گەیشتنە ئەوە رادەیە کەموچەخورانی میری لەدەوایردا دەبوایە بەقسەو فەرمانی ئەوان کاربکەن. خەڵکی رەشورووتیان لە کوردستاندا بەوە تەفرەدابوو و خستبویانە دوای خۆیان کە زەویان بۆ لەئاغاو خاوەنموڵکەکان دەستێننو بەگوریس بۆیان دەپێون. بەوەش نەوەستابوون، لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا دەستیان کرد بە ئیهانەی ئاغایەکانو زۆر کەسیشیان بە جادەدا رادەکێشا. حیزبی شیوعی وای لێهاتبوو کە رازی نەبوو کەس ناوی پارتیو کوردو کوردستان بهێنێت. گەیەشتە ئەوەی مەترسی بکەوێتە سەر وجودی پارتیو لەناو ئاگری شیوعیەتدا بە تەواوی بتاوێتەوە.

## بەناوی لقی پارتی عەشایر بۆ بەخێرهاتنی مەلامستەفا چووینە بەغدا

دوای هاتنەوەی مەلامستەفا بۆخاکی عیراق، ئێمە چەندکەسێک لە لقی پارتی عەشایری پشدەرو هەباسی مامەندئاغاش بەناوی رانیە بەیەکەوە بۆ بەخێرهاتنەوەی مەلامستەفا رویشتینە بەغدا. ئێمە لەلقی پشدەر تەنیا چوار کەس وەکو نوێنەرانی "لق" رۆیشتین  کە بریتی بووین لە حەمەی هەباسئاغا، مامەندی سلیمئاغا، هەمزەی باپیرئاغا، حاجی مەحموودئاغاو خۆم. ئێمە وامان هەست دەکرد کە بەشێکین لە پارتیو دەچینە بەخێرهاتنی سەرۆکی پارتی. بەهۆی مامۆستا هەمزە عەبدوڵلاوە چاومان بە مەلامستەفا کەوتو یەکەیەکە نەک بەناوی عەشایر، بە ناوی پارتەیەوە ناساندنیو ئەوچەند رۆژانەی کە لە بەغدا بووین، جارێکیتریش مەلامستەفاما دیتو زۆر لەگەڵمان دانیشتو چونکە

جگە لە بەخێرهاتنی مەلامستەفا زیاتر هیچ ئیشمان لە بەغدا نەبوو، بۆ گەڕانەوەمان ئیزنمان لێوەرگرت. بەڵام هاوڕێیەکانم گوتیان مادام ئێمە هەر هاتوینە بەغدا، باشتر وایە بچین زیارەتی عەبدولکەریم قاسمیش بکەین. منیش گوتم ئێمە هیچ ئیشمان بە عەبدولکەریم قاسم نیە تا بچینە لای‌و دیدەنی بکەین. ئەوانیش گوتیان ئێمە بەپێویست دەزانین کە دەربارەی وەزعی ئاڵۆزی پشدەرو دەستدرێژی شوعیەکان بۆ سەر ئاغاکان قسە لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم بکەین، تاکو بەناوی هەموو عەشیرەتی پشدەر ئەم گیروگرفتانەی بخەینە بەرچاو، دەبێ تۆش لەگەڵ دابی. منیش گوتم برایان ئەمە واجبی ئێمە نییەو دەبێ بابەکرئاغا کە خۆی سەرۆکی عەشیرەتی پشدەرە، ئەم داوایانە بخاتە پێش‌چاوی کاربەدەستانی بەرزی میری‌و ئەگەر ئێمە بەناوی لقی پارتی عەشایریش بچین، دەبێ پێشەکی رای مەکتەبی سیاسی وەربگرین. چونکە رێگای رێکخستن (تەنزیم) وایەو هیچ ئەندامێک مافی ئەوەی نییە کە سەربەخۆ بچێتەلای کاربەدەستانی میری. بەڵام ئەوان هەر لە سەر رای خۆیان سوربوون‌و من ناچاربووم ئاگاداری هەمزە عەبدوڵڵام کردو ئەویش هاتە لایان‌و هەر قسەکەی منی پێ‌گوتن‌و بۆیانی دووپات کردەوە. دیسان هەر رازی نەبوون‌و هەر دەیانویست برۆن بۆلای عەبدولکەریم‌و منیشیان لەگەڵدابم. ئەمجا کە دیتم خەریکن لەخەتی رێکخستن برۆنە دەرەوەو باوەڕیان بەبریاری پارتی نییە، پێم گوتن ئێوە هەرچی دەکەن من لەگەڵتان نیم‌و تازە جارێکی‌تریش ئامادە نابم لەگەڵتان بەشداری هیچ کۆبوونەوەیکی بەناوی لقی پارتی عەشایر بم، چونکە زۆر لێم روونە ئێوەو کوردایەتی‌و پارتایەتی لەیەکتر دوورن‌و لەوەی کەوا زۆر خۆم لەگەڵ ئێوەدا ماندووکردووە، زۆریش پەشیوانم. هەر لە بەغدا ئەوانم بەجێ‌هێشت‌و گەڕامەوە پشدەرو جارێکی‌تر لەگەڵیان دانەنیشتمەوەو ئەوانیش بەتەواوی وازیان لەپارتی هێنا.

## رۆیشتنی ئاغایەکانی نیزیک سنووری ئێرانو پەنا بردنیان بۆلای حکومەتی ئێران

هەروەکو پێشتر باسمان کرد کە حیزبی شیوعی عیراقی چۆنو بەچ شێوەیەک لە کوردستان دا خەریکی خۆش کردنی ئاگری ئاژاوەو شەڕ دروستکردن بوو. حکومەتی عەبدولکەریم قاسمیش تا رادەیەک پشتی دەگرت. بەمجۆرە حیزبی شیوعی کەوتە لادان لەخەباتی یاسایی‌و گەیەشتە ئەوپەڕی سەرکێشی‌و لاجەڵەوی. یەکەم دروشمی خۆپێشاندانەکانیاندا، داوای بە دەستەوەگرتنی بێ ئەملاوئەولای دەستەڵاتی سیاسی عێراقیان دەکرد. (حزب الشیوعی للحکم مطلب عظیمی) ئەم هەڵچوونو سەرکێشیەی حیزبی شیوعی کارێکی وای کرد کە دەوڵەتانی رۆژئاواو جیرانەکانی عیراق مەترسی ئەوەیان لێ پەیدا ببێت کە حکومەتی عەبدولکەریم قاسم شیوعیەو بوونی لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا نەگونجێتو پێویستە چارەی بۆ بدۆزنەوە. ئەوەبوو زۆری نەخایاند کە باڵوێزخانەکانی ئەمەریکا و ئێران لەبەغدا کەوتنە جۆڵەجۆڵو بە نهێنی لەگەڵ هێندێ لەسەرۆک عەشیرەتەکانی کوردستاندا پەیوەندیان کردو هانیان دان کەوا بچنە ناو خاکی ئێرانەوەو لەدژی حیزبی شیوعی‌و حکومەتی عەبدولکەریم راپەڕن. ئەوەبوو دەست کرا بە رۆیشتن و بەماوەیەکی زۆر کەم بەشێکی زۆر لە عەشایرەکانی کوردستانی عێراق گەیەشتنە ناو خاکی ئێرانەوە.

داودبەگی جاف، شێخ رەشیدی لۆلان عەشیرەتی برادۆست، بەشێک لەعشیرەتی پشدەر (ئاغای میرئاودەلی)، ئاوڕەحمان حەمەرەشید ئاغای لوڕک (سیوەیل) لە گەڵ خزمەکانی ئەمانە هەموویان لەئێران رێزیان لێگیراو بە چەکو پارە تەسەلیان کردن. ئەو ئاغایانەی پشدەر کە رۆیشتن زیاتر ئەمانە بوون کەوا لە "لقی پارتی عەشایر" ناویان هەبوو و ئەندامی ئەو وەفدەش بوون کە بۆ بەخێرهاتنەوەی مەلامستەفا لەگەڵ مندا هاتبوونە بەغدا. ئەمانە بە فەرمانی بابەکرئاغا رۆیشتن. بابەکرئاغا خۆی لەلای هەرسێ حکومەتەکانی ئەمەریکا، ئینگلیزو ئێران رێزێکی تایبەتی هەبوو و زۆر باوەڕیان پێدەکرد. بابەکرئاغا "بایزی" کوڕی خۆی کردە لێپرسراوی هەموو ئاغایەکانی پشدەر

کەوا چووبونە ناو ئێرانەوە. ئەوجا حکومەتی ئێران هانیدان کە چکداری خۆیان بنێرنەوە عیراق‌و دەست بەترساندنی حیزبی شیوعی بکەن. عەشایرەکان ئەو کارەیان کردو چەند کەسانێکی شیوعیان کوشتن‌و هێندێکیشیان تالان کردن‌و جووتیارەکانیان ناچارکرد واریدات‌و موڵکانەیان بۆبنێرن‌و ئەگەر یەکێک لەپشدەر لایەنگریی ئەوانی نەکردبایە، هەڕەشەی کوشتنیان لێ‌دەکرد. چونکە پشتگیری رۆیشتنی ئەوانم نەکردبوو، هەڕەشەیان لە منیش دەکرد. ئەوەی راستی بێت چونکە لەدەستی شیوعیەکان زۆر بێزاربوون، من رۆیشتنی ئەوانم بە ناحەق نەدەزانی، بەڵام من وەکو ئەندامێکی پارتی ئیلتزاماتی سیاسیم هەبوو و خۆم بە خاوەنی "مبدأ" دەزانی، بۆیە نەمدەتوانی تەئیدیان بکەم‌و بۆمەبەست‌و مەرامێکی کاتی‌و بێ‌بنەڕەتی، ببم بە داردەستی خەڵک. وەزعی کوردستان لە ماوەی چەند مانگێکدا گەڕایەوەسەر باری جارانی ئاغایەتی‌و حیزبی شیوعی لەکوردستاندا ناوو ناوەرۆکی نەماو حکومەتی عەبدولکەریم قاسمیش شێوەی هەڵوێست‌و رەوشتی گۆڕاو لەدەست درێژی کردنی حیزبی شیوعی زۆر کەم کردەوە. بە تایبەتی لە کەنیسەی "ماری یوسف" لە وتارێکدا زۆر بە توندی دژی حیزبی شیوعی قسەی کرد.

### تەوقیف بوونم لەبەغدا بۆ چەند رۆژێک

لەساڵی ١٩٦٠ مانگی شوبات سەفەرێکم بۆ بەغدا کردو چەند رۆژێک مامەوە. شەوانە لای کوڕەکانی مەحموودئاغا دەخەوتم.

ئەوان لەقوتابخانە بوون‌و خانویەکی باشیان گرتبوو. هێندێک شەویش بۆ زیارەت دەچومە ماڵی مەلامستەفا کە ئەوکاتە لە خانوی "سەباح"ی کوڕی نوری‌سعیددا بوو. من کاتێ ویستم بگەڕێمەوە بۆ پشدەر، مەکتەبی سیاسی داوای لێکردم "گونیە"یەک بەیاناتی پارتی لەگەڵ خۆمدا هەڵبگرم بۆ کەرکوک‌و لەوێ بیاندەمە "عومەر دەبابە" کە ئەوکاتە ماڵی لەکەرکوک بوو. بڵاوکراوەکان چونکە مۆری رەقابەی عەسکەرییان لەسەر نەبوو، بەپێی یاسای رۆژنامەگەری قاچاخ بوون. منیش هەرچەندە ئیشەکەم بەدڵ نەبوو و لێی دەترسام، بەڵام

حەزیشم نەکرد کە داواکەیان رەد بکەمەوە. بەناچاری بڵاوکراوەکانم وەرگرتن. ئەوکاتە روخسەتی ئیش کردن بۆ پارتی لەلایەن میرییەوە دەرنەچوبوو و لە بارەگای نهێنیدا ئیشیان دەکردو چەند ژوورێکیان لە ئوتێلی "ترۆکادیرۆ" گرتبوو و مەکتەبی سیاسی لەوێدا کاری دەکردو رێگای هەموو کەس نەدەدرا بچێتە لایان‌و بەجێگایان بزانێت. من بڵاوکراوەکانم وەرگرتن‌و خستمنە ناو تاکسی. بە نیازی ئەوە بووم نیوەرۆ بچمەوە ماڵی کورەکانی مەحموودئاغاو ئێوارەش بەشەمەندەفەری دەرجەیەک برۆم بۆ کەرکووک. مەبەستم لە سواربوونی دەرەجەیەک ئەوەبوو لەرێگا تەفتیش نەدەکرام. لە شەقامی رەشیدەوە کە بەرەو "بابولموعەززەم" دەهاتم، دووکەس (حەرس مقاوەمەی شەعبی) دەستیان راگرت‌و لەگەڵمدا سواربوون. ئەوان هەردوو لە پێشەوەو منیش لەگەڵ بڵاوکراوەکان کە یەک گونیە بوون، لە دواوە سواربووم. یەکێک لە حەرەسەکان دەستی بۆ گۆنیەکە درێژکردو گوتی ئەمەچیە؟ گوتم کەل‌وپولە. پەرێکی لەبڵاکراوەکان دەرهێناو سەیری کرد کەوا بەکوردی نووسرابوون، گوتی بۆم بخوێنەوە چییەو بۆچی مۆری "رەقابە"ی لێنەدراوە. منیش هێندێ تەنگاوبووم‌و نەمزانی چی جواب بدەمەوە. گوتم ئەگەر راستیتان دەوێت، من هیچ پەیوەندیم بەم نووسراوانەوە نییەو ئیمرۆ یەکێک لە کوردەکانی کەرکوک لەناو "شارع ئەلرەشید" تکای لێکردووم ئەم "گۆنیە"ی بۆ بگەیەنمە چایخانەی عاشوری کەرکوک. ئەوانیش گوتیان شتی وا نییەو ئەم بڵاوکراوانە دژی میرین، ئەگینا مۆری رەقابەیان لەسەر دەبوو. هەر لەسەر رێگاوە دایان‌بەزاندم‌و لەگەڵ بڵاوکراوەکان بە مەرکەز شورتەی وەزیرییەیان سپاردم. یەکسەر بردیمانە لای معاون شورتەو دەستیان بە لێکۆڵینەوە کرد. من هەر هەمان وەڵامم دووپات کردەوە، واتە ئەو قسەی لای "مقاوەمە شەعبیەکان" گوتبووم. ئەو جار داوایان لێکردم بڵاوکراوەکان بە عەرەبی تەرجومە بکەم. منیش گوتم ناتوانم تەرجومە بکەم‌و هەرچی هەوڵیان‌دا لە شورتەکانی ناو مەرکەزەکە کەسیان دەست نەکەوت بۆیان تەرجومە بکات. لە ئەنجامدا ناردراین بۆ شورتەی "فەزل"و لەوێش هەرهەمان ئیفادەم بەبێ زیادوکەم دایەوە. لەوێوە

ئەوجارە ڕەوانەی "ئەمنی عامە"یان کردم. ئەمنی عامە ئەو کاتە لەگەڵ "مودیریەتی عامی شورتە" لە "مەرکەزی سەرای کۆن" لە یەک نیزیکبوون. کاتێ گەیشتینە ئەمنیعامە، سەعات ١٢ی شەو بوو. بەو هەموو ڕاوەستانو هاتنو چوونەوە، زۆر ماندوو بوومو لەبەیانیەوە هیچ خواردنیشم نەخواردبوو. لە ئەمنیعامەش دیسان هەرهەمان ئیفادەم دایەوە. معاون ئەمنەکە ناوی محەممەد شیتو پیاوێکی باش دیاربوو. چونکە دەیزانی زۆر ماندووم، منی دانا تا هێندێ پشوو بدەم. لە دواییدا بۆ تەرجومەی بڵاوکراوەکان ناردی یەکێکیان هێنا بە ناوی محەممەد عەزیز کە ئەویش هەر معاون شورتەی ئەمن بوو، بەڵام بە دیشداشەوە هاتو پێشەکی پرسیاری لێکردم گوتی برام تۆ لە کوردستان خەڵکی کام شوێنی؟ گوتم خەڵکی پشدەرم. گوتی ئاغای یا کرمانجی؟ گوتم جاران ئاغا بووم، بەڵام ئێستا هیچ. گوتی خزمایەتیت لەگەڵ بابەکرئاغای گەورە هەیە؟ گوتم، بەڵێ خزمین. ئەویش هەستاو زۆر بەخێرهاتنی گەرمی لێکردمو گوتی من لە ماڵی بابەکرئاغادا گەورە بوومو بە ئەسل خەڵکی گوندی بیتووشیکوردستانی ئێرانمو دایکم هەر لەماڵی بابەکرئاغادا بووە تا گەورە بوومو لە دواییدا هاتووینە بەغداو ئێستە معاونی شورتەم. ئیتر هەر سەرپێی چاوێکی بە بڵاوکراوەکاندا خشاندو گوتی لە سایەی خواوە هیچ شتێکی دژی میرییان تێدا نییە. گورج تەرجومەی کردو دایە دەستی "محەممەد شیت"و ئەویش بڵاوکراوە تەرجمەکراوەکەی لەگەڵ نووسراوێکی دایرەی ئەمنی عامەی نارد بۆ حاکم تحقیقی (رصافە) بۆ ئەوەی بە کەفالەت بەرهەڵدا بکرێم. کات دووی شەو بوو کە وەرامی حاکم هاتەوەو بڕیاری توقیفی دابووم. ڕاستی محەممەد شیتو محەممەد عەزیز زۆر پێیان ناخۆش بوو و گوتیان ئێمە دەزانین کەحاکم خۆی شیوعییەو لە دژی پارتی ئەم بڕیارە نابەجێو ناحەقەی داوەو ئێستە هیچ چارە نییە دەبێ ئیمشەو لە تەوقیفـدا بمێنیو بۆ بەیانی ئاگاداری "عبدولباقی کازم" مودیر شورتەی عام دەکەین کە بە دەستەڵاتی خۆی بتوانێت بە کەفالەت بەرهەڵدات بکات. بەهەرحاڵ ئەو شەوە خستیانمە بەندیخانەوە، چ بەندیخانەیەک؟ ژوورێکی سێبەچوار نیزیکەی چل تا پەنجا

کەسی تێدابوو. ئەو شەوە وامدەزانی کە خراومەتە ناو "گۆڕ"و گۆڕەوشار دەدرێم، چونکە بە درێژایی تەمەنم نەکەوتبوومە ناو بەندیخانەی گشتیەوە. ماوەی چوار رۆژی تەواو لەناو بەندیخانەدا چاوەڕوانی ئەوە بووم کە بەڵکو محەممەد شێتو محەممەد عەزیز لای "عەبدولباقی کازم" شتێکم بۆ بکەن، بەڵام هەر لە بیریان چووبوومەوە. ئینجا ویستم خۆم هەوڵێک بدەم، دیتم لە ئێشکچیەکانی شوڕتەی بەر دەرگای بەندیخانە یەکێکیان سەروشکڵی لە کورد دەچوو، بانگم کرد گوتم تۆ کوردی؟ گوتی فەرموو چی ئەمر دەکەی. زۆر پیاوانە هاتە پێشو گوتی من خەڵکی گوندی "چەرمەگا"م. گوتم دوو کەلیمە دەنووسم بۆم بگەیەنە "ئوتێلی ترۆکادیرۆ" گوتی بەسەرچاو. تەنیا هەر ئەوەندە وێرام کە لە سەر پارچە کاغەزێکی وەکو "نوشتەی مەلا" بە ناوی نهێنی خۆم "رنجبەر" بنووسم: "من ئێستە لە بەندیخانەی مەرکەزیم"و دامە دەستی شوڕتەکە. بە دەمیش (شفاهەن) تێمگەیاند کە لەئوتێلەکە بڕواتە قاتی سێو ژمارەی ژوورەکەشم پێدا. چەندی کردم، پارەی کرێی ترۆمبێلیشی لێوەرنەگرتمو رۆیشت. ئیتر زۆری پێنەچوو سالح حەیدەری ئەندامی مەکتەبی سیاسی هاتبۆلامو پێخەفو خواردنو شتی بۆ هێنامو گوتی ئێمە وامانئەزانی تۆ دەمێکە گەیەشتوویتە کەرکوک. منیش باسەکەم بۆ گێرایەوەو پێمگوت دیارە ئەو کاتەی ئەو بڵاوکراوانەم لەئێوە وەرگرتووە، سیخوڕ (جاسووس) لەلای خۆتانەوە دەرچووەو ئاگاداری دایرەی "مقاومەی شەعبی" کردووە، ئەگینا چۆن ئەمانە یەکسەر هاتنەپێش ئەو تاکسیەی کە من سواری بووم؟ گوتی باشە هەر ئێستە دەچمە لای مامۆستا هەمزە کە ئەویش بچێتە لای مەلامستەفا کە بەڵکو چارەیەک بدۆزنەوە. هەر بۆ رۆژی دووەم بۆ لای مودیر شوڕتەیعام "عەبدولباقای کازم" داوایان کردمو دیتم شێخ سادق برازای مەلامستەفا لای عەبدولباقی دانیشتووەو هەردوکیان هەستانو بە گەرمی بەخێرهاتنیان کردمو عەبدولباقی گوتی تۆ لە ئیفادەی خۆتدا گوتووتە من پەیوەندیم لەگەڵ پارتیدا نییە. ئەی کەوایە بۆچی ئێستا شێخ سادق هاتووەو خەریکی کارەکەی تۆیە؟ منیش گوتم مەلامستەفا نەک هەر سەرۆکی پارتیە، بەڵکو سەرۆکی هەموو گەلی

کوردەو دەبێ بە کاری هەموو کەسێکەوە ماندوو بێت. ئیتر ناوبراو بە دەستەڵاتی خۆی بە کەفالەتی شێخسادق بەرهەڵدای کردمو بڵاوکراوەکانیشی دایەوە دەستی خۆمو گوتی بیانگەیەنە ئەو شوێنەی کە پێتسپێردراوە. گوتم ئەگەر نووسراوێکم پێنەبێت، دیسان لەڕێگا دەمگرنەوە. ئەویش گوتی ناتوانم نووسراوی ڕەسمی بدەم، بەڵام لەهەر جێگایێ تۆ گیرای، هەر دەتهێننەوە لایخۆم. بەهەرحاڵ بڵاوکراوەکانم وەرگرتەوەو هەر ئەو شەوە بە شەمەندەفەری دەرەجەیەک ڕۆیشتمو بۆ بەیانی گەیشتمە کەرکوکو یەکسەر چوومە ماڵی کاک عومەر دەبابەو بڵاوکراوەکانم پێدا. ئەویش گوتی چەند ڕۆژە برادەران لە بەغداوە تەلەفۆنیان بۆ کردووم کە شتەکانمان بەهۆی فلان کەسدا ناردوونو من هەر چاوەڕوان بووم. منیش ڕووداوەکەم بۆ باس کردو هەرهەمان ڕۆژ هاتمەوە بۆ پشدەرو وامزانی کە کۆتایی بەم ئیشە هاتووەو جارێکیتر دادگا بانگم ناکاتەوە. بەڵام وەکو من تێگەیشتبووم وادەرنەچوو. هەر دوای سیچوار ڕۆژ بە برووسکەیەکی تایبەتیو بەپەلە لە دادگای عورفی عەسکەری داوا کرام، بە مەرجێ لە ماوەی ٤٨ سەعاتدا لە دادگای سەربازخانەی "وەشاش" ئامادە بم. منیش چوومە لای مامۆستا هەمزەو بەیەکەوە ڕۆیشتینە لای مەلامستەفا. ئەویش شێخسادقی لەگەڵا ناردمەوە لای عەبدولباقی کازمو ناوبراو گوتی دیارە حاکمی "ڕەسافە" بەربەرەکانی ئێمە دەکات، ئەگینا پێویستی بەوە نەدەکرد ئەم ئەوراقانە بدرێتە دادگای عورفی عەسکەری. گوتی سەرۆکی دادگای عەسکەری شەمسەدین عەبدوڵڵا برادەری خۆمەو کارێکی وا دەکەم یارمەتیتان بدات. هەرهەمان کات تەلەفۆنی بۆ کردو نووسراوێکیشی پێدامو گوتی لە کاتی پشوودانی دادگادا ئەو کاتە شەمسەدین عەبدوڵڵا دەچێتەوە ژوورەکەی خۆی ئەم نووسراوەی بۆ بنێرە ژوورەوە.

عەبدولباقیکازم خۆی یەکێک لە ئەفسەرەکانی زۆر نیزیکی عەبدولکەریمقاسم بوو و بە شێوەی کاتی لە شورتەی عامە دانرابوو. هەر ئەو کاتە ڕۆیشتمە "وەشاش"و دیتم بە سەدان کەس لە دەرگای دادگا وەستاونو هەر یەکەیان بە تاوانێ داواکراون. هەروەها زۆر لە پارێزەران خەریکی

وەرگرتنی داوای خەڵکن‌و یەک دوانێکیان داواشیان لەمن کرد کە بە پارێزەری خۆم بیانگرم، بەڵام لەبەرئەوەی نووسراوی عەبدولباقیم پێ‌بوو، لە خۆم نەدەترسام تا پارێزەر بگرم. دیتم "مقاوەمە شعبیەکان"و شوفێری تاکسیەکەش لەوێ وەستان کە ئەوانیش وەکو من داواکراو بوون. بەهەرحاڵ تا نیوەڕۆ وێستام‌و کاتی پشودانی دادگا هات"و منیش ژوورەکەی شەمسەدین عەبدوڵلام بە پرسیار دۆزیەوەو نووسراوەکەم دایە دەستی فەڕاشەکەی‌و ئەویش بانگی کردمە ژوورەوەو گوتی تۆی نووسراوی عەبدولباقی کازمت هێناوە؟ گوتم بەڵێ. ناوبراو مەبەستی ئەوەبوو بە سەروشکڵ بمناسێت. لە دوای چەند سەعات بۆ ژووری دادگا بانگیان کردم‌و خستمیانە ناو "قەفەسی ئیتیهام"و چەند ئەفسەری‌تری بە روتبەی عەمیدو عەقید کە ئەندامی‌دادگا بوون، دانیشتبوون. داواکاری گشتی (مدعی عام) لایحەی تۆمەتی منی خوێندەوەو بە چەند مادەی یاسایی داوای حوکم‌دانی کردم. منیش راستی ترسام لەوەی کەوا بیستبووم بڕیارەکانی دادگای عورفی عەسکەری شتێکی دوور لە یاساو بە کەیفی خۆیانە. ئەمجا مقاوەمە شەعبیەکان لەسەر من دەستیان کرد بە قسەی خراپ، بەڵام شوفێری تاکسیەکە گوتی من ئاگاداری هیچ نیم‌و تەنیا کرێی خۆم وەرگرتووە. ئەمجا منیش وەکو شریتی تەسجیل هەر قسەکەی جارانم دووپات کردەوە. سەرۆکی دادگا پرسیاری لێکردم‌و گوتی تۆ نوێژ دەکەی؟ گوتم چۆن ئیسلام نوێژ ناکات؟ گوتی سوێند دەخۆی کە نەتەزانیوە ئەو بڵاوکراوانە لە دژی میرین؟ گوتم بەڵێ سوێند دەخۆم‌و لەوێ بە قورئان سوێندیان‌دام‌و تەبرەئە بووم. راستی من سوێندم بە درۆ نەخوارد، چونکە ئەو کاتەی مەکتەبی سیاسی بڵاوکراوەکانی پێدام گوتیان هیچ‌شتێکی دژی میری‌یان تێدا نەنووسراوە، جگە لە هێندێ رەخنەو رەخنەکاری لە دژی هێندێ لە کاربەدەستانی عەسکەری وەکو "مستەفا راغب"و ئەوانە کە ئەو کاتە لە کوردستان ئیشیان دەکرد. ئیتر هەر چۆنێک بوو خواوەند بە لوتفی خۆی رزگاری کردم، ئەگینا کەمتر لە دوو ساڵ حوکم نەدەدرام.

**ئیجازەی رەسمی بۆ پارتیو دەرچوونی رۆژنامەی خەبات**

دوای هاتنەوەی مەلامستەفا بۆ عیراق، پارتی دیموکراتی کوردستان زۆر بووژایەوەو لەناو کوردستاندا خەڵک رووی کردە پارتیو رۆژبەرۆژ زیاتر دەهاتنە ریزی رێکخستنەوە. لە ئاستی سیاسیشدا پارتی دەوری خۆی وەرگرتو لە کاتێکدا کە جاران دانیان بە پارتیدا نەدەهێناو لە بەرە "جبهە"ش وەریان نەدەگرت، ئەمجار هەموو حیزبە سیاسیەکانی عیراق ئامادەبوون لە پارتی نیزیک ببنەوە. پارتی بە ماوەیەکی کەم ئەو سەرکەوتنانەی خوارەوەی وەدەستهێنان:

١- حکومەتی عەبدولکەریم ئیجازەی رەسمیدا بە پارتی کە چالاکی سیاسی خۆی بە ئاشکرا بنوێنیو بارەگاکانی خۆی لە هەموو پارێزگاکانی کوردستانو هەروەها بەغدادا بکاتەوە.

٢- رۆژنامەی خەبات رۆژانە لەلایەن پارتیەوە دەرچوو و لە هەموو رۆژنامەکانیتری عیراق باشتر و زیاتر دەفرۆشرا.

٣- حکومەتی عەبدولکەریم قاسم لە مادەی "٣"ی دەستوری کاتیدا دانی بەوەداهێنا کە عەرەبو کورد لە نیشتمانی عیراقدا هاوبەشن کە ئەمە دەقەکەیەتی: "أن العرب و الكرد شركاء في هذا الوطن". لە هەموو حیزبە سیاسیەکانی عیراقی، تەنیا هەر حیزبی شیوعی بوو کە هەمشە دەیگوت پارتی سەر بە جیهانی ئیستعماریەو رۆژێ لە رۆژان داوای جیابوونەوە دەکات. عەبدولکەریمیش خۆی لە هەردوو ئەو حیزبانە (پارتیو شیوعی) دەترساو نەیەویست هیچ کامیان وا بەرز ببنەوە کە بۆ دەستەڵاتەکەی خۆی لە دوارۆژدا جێگای مەترسی بن. هەربۆیە کارێکی وای کرد حیزبی شیوعی دووبەرەکی تێبکەوێتو بۆ ئەو مەبەستەش حیزبێکی شیوعیتری بەناوی "داودصایغ" دروست کردو ئیجازەی رەسمی پێدا. بەڵام بۆی نەکرا لە ناو پارتیدا دووبەرەکی دروست بکاتو تەنیا هەمزەعەبدوڵڵا سکرتێری پارتی بەخۆیو چەند کادرێکیتری پێشکەوتوو ویستیان کە لە پەیرەو و پرۆگرامی پارتی لابدەنو بکەونە سەر ئیتجاهی حیزبی شیوعی. ئەوەبوو مەلامستەفا ماوەی ئەو

لادانەی نەداو بە شێوەیەکی نادیموکراتیانە هەمزەی عەبدوڵڵای لاداو ئیبراهیم ئەحمەدی لە جێگای ئەو کردە سکرتێری پارتی. عەبدولکەریم کاتێ بۆی دەرکەوت لە ڕێگای سیاسیەوە ناتوانێت پارتی لاواز بکات، دەستی بە هاندانی عەشایرەکانی زێباریو هەرکیو سۆفی لە دژی مەلامستەفا کردو بە شێوەیەکی نهێنی چەکو پارەشپێدان. دوای ئەوە چەند تێکهەڵچوونێک لەنێوان ئەو عەشیرەتانەو بارزانیەکان ڕوویداو دوژمنایەتی کۆنیان تازە کرایەوە. کێشەکە گەیشتە ئەوە کەشێخ ئەحمەدی برای مەلامستەفا چوار کەسی تایبەتی خۆی بۆ کوشتنی ئەحمەدئاغای زێباری ناردنو لەناو شاری موسڵدا دایانە بەرگوللەو کوشتیان. ئەم چوار کەسانە خۆیان بە دەستەوەداو لە موسڵ خرانە ناو بەندیخانەوەو لە دواییدا ناردیاننە سلێمانیو پێش ئەوەی حوکم بدرێن، لە دادگا هەلیان بۆ ڕێکەوتو رایانکردو خۆیان گەیاندەوە بارزان. بکوژەکانی ئەحمەدئاغای زێباری بریتی بوون لە مەلاحەسەن بارزانی، هاچاک بارزانی، عیسا سوار بارزانیو سەعید کە ناوی باوکیم لەبیر نەماوە. ئەم ڕووداوە کە لە سەرەتای ساڵی ١٩٦١دا ڕوویدا، سەرلەنوێ دوژمنایەتی کۆنی مابەینی بارزانیو زێباریەکانی تازەکردەوەو ناوچەکانی بادینانیش زیاتر لەجاران شێوانو ئاڵۆزبوون. عەبدولکەریم واتێگەیشت هەستانی ئەو عەشیرەتانە لە دژی مەلامستەفا دەبێتە هۆی نزمبوونەوەی پلەی مەلامستەفاو سەرلێشێواندنی، بەڵام بەپێچەوانەوە مەلامستەفا نەک هەرنەترساو سەری لێنەشێوا، بەڵکو زیاتر ڕقی لە عەبدولکەریم داگرتو هەوڵیشیدا کە ئەو سەرۆک عەشیرەتانەی کە خۆیان خستۆتە باوەشی عەبدولکەریمەوە، هەموویان لەناو بەرێت. ئەوەبوو بارزانیەکان کەوتنە شەڕکردن لەگەڵ عەشیرەتی "برادۆست"و "سۆفی"و هەروەها لەگەڵ عەشیرەتی "ڕێکانی"و لەلایەکیتریشەوە مەحموودکاوانیو چەند کەسێکیتر لە خۆشناوەکان "سدیق میران"یان کوشت. مەحموود کاوانی لەبەر ئەوەی کە ئەندامی پارتی بوو، وا زانرا کە مەلامستەفا هانیداوە کە سدیق میران بکوژێت، چونکە سەر بە عەبدولکەریم قاسم بووە. ئەم ڕووداوەش لە کوردستان بوو بە سەرباری هەموو ئەو ڕووداوانەیتر.

ئەمجا عەبدولکەریم نەیویست راستەوخۆ لە مەلامستەفا بداتو وای باشزانی کە جارێ پارتی بشکێنێتو ئیبراهیم ئەحمەدی سکرتێری پارتی بە کوشتنی سدیق میران تاوانبار کردو درایە دادگاو لەپاش کێشەو بێشەیەک ناوبراو "تەبرئە" بوو. بە هەرحاڵ ئەم رووداوانە کوردستان هەر دەهاتو رۆژبەرۆژ لە زیادبوون دابوون تا ئەوەبوو بارودۆخی کوردستان بە تەواوی شڵەژاو مەلا مستەفا خۆشی هاتەوە بارزانو نەیوێرا چیتر لە بەغدا دابنیشێت. هەروەها ئەندامانو کەوادیری پارتیش دەستیان کرد بە راکردن لە بەغداو بەشێکیشیان لێ گیران.

ئەوجا سەرۆک عەشیرەتەکان لە ناوچەکانی سۆراندا بەتایبەتی هەباسی مامەندئاغاو پشدەرییەکانو مەنگورو خۆشناوەتیو جافەتی هەتا دەگاتەوە عەشیرەتەکانی لای سلێمانی، هەموویان خۆپیشاندانێکی چەکدارییان لە دژی عەبدولکەریم قاسم ساز کردو لە هەموو سەر شەقامە سەرەکییەکان چەکداریان دابەزاند. کەو خۆپیشاندانەدا ئەوداوایانەی خوارەوەیان لە میری هەبوو:

١- لابردنی یاسای چاککردنی کشتوکاڵ. (أصلاعی زراعی)

٢- بژاردنەوەی خەساراتی ئاوی دوکانو دەربەندیخان. (تعویض)

٣- نەمانی روخسەتی چاندنی توتن. واتە هەر کەسێ ئازاد بێت بە بێ (أجازەی زرع) توتن بچێنێت.

٤- بەرهەڵدانی هەموو گیراوە سیاسیەکان.

بەڵام عەبدولکەریم قاسم گوێی بۆ ئەم داوایانەی عەشایر شلنەکردو لەئەنجامدا وای لێهات هەستانی ئەم عەشایرانە ببێتە بناغەو بنچینەیەک بۆ دامەزراندنی شۆڕشی ١١ی ئەیلولی ساڵی ١٩٦١.

من لێرەدا کۆتایی بە نووسینی یادداشتەکانم دەهێنمو داوا لە خوێنەرانی خۆشەویست دەکەم لە هەموو کەمو کورتیەکانم ببورن. زۆر سوپاس بۆ یەزدانی مەزن کەوا توانای دام ئەم کارە ئەنجام بدەم.

٢٠/٨ی ساڵی ١٩٨٢ ئەم یادداشتەم تەواو کردووە.

**لەبارەی "ئەنجومەنی ماقوولان" کە لە پێشەوە باسم کرد**

لەوانەیە زۆر لە خوێنەرانی خۆشەویست وا تێبگەن کە ئەو ئەنجومەنە تەنیا هەر شتێکی شکڵی بووەو دەستەڵاتی تەواوی پێنەدراوە. بۆ روونکردنەوەی راستی ئەم بابەتە، ئەم بەڵگانە دەخەمە بەرچاوی خوێنەری خۆشەویست:

١- من بەچاوی خۆم ئەو ئەنجومەنەم چەندین جار دیتووەو زۆربەی ئەندامەکانیشم لەنزیکەوە دەناسین.

٢- زۆر کەسی‌تریش لە پیاوانی ناوچەی پشدەر خۆیان ئەنجومەنی پیاوماقووڵانی پشدەریان وەبیر دێتەوە.

٣- دەرکردنی تایفەیەک بەفەرمانی ئەنجومەنی پیاوماقووڵان کە پێک هاتبوو لە چەندسەد خێزانێک، بەڵگەیەکی زیندوویە. هەروەکو لە پێشەوە باسم کردووە، ئەو تایفەیە (تایفەی بەگزادە) هەموویان ئامۆزاو کوڕئامۆزای میرئاودەلیەکان بوون. ئینجا لێرەدا پرسیارێک خۆی قوت دەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە ئایا هیچ لێپرسراوێکی دەستەڵاتدار نەک هەرلە کوردستان بەڵکو لە هەموو رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا رازی دەبێت خزمو کەس‌وکارەکانی وا بەکۆمەڵ لەناوچە دەربکرێن؟ بێ‌گومان نا، هەرچەند ئەگەر دەرکراوەکان تاوانباریش بن، هەرگیز شی‌وا ناگونجێت. ئەوەی ئێستا ئێمە لەو رۆژگارەدا کەوا بە ناوی ئەوپەڕی دیموکراتی‌و مافی مرۆڤ هەیەو دەیبینین کە ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بەردەوام لەئیش‌کردن دایە، بەڵام ئایا بڕیارەکانی ئەو ئەنجومەنەی ئاسایش هەموویان وەک خۆی جێبەجێ دەکرێن؟ نەخێر، بەڵگەش ئەوەیە کەوا دەیان‌و سەدان بڕیار لە دژی جوولەکە دەرچوون‌کە هەمووشیان تەنیا مەرەکەبی سەر کاغەزن‌و هیچی‌تر. بەڵام ئەوەی راستی بێت لە کاتێکدا کەوا پلەی خوێندەواریش زۆر نزم بووەو بە دەگمەن خوێندەوارێک لەناو گوندێکدا دەست نەکەوتووە، ئەو ئەنجومەنەی پیاوماقووڵانی پشدەر بۆ دەرخستنی مەودای دیموکراتییەت‌و پێشکەوتن نیشانەیەکی دیارو رازاوە بوو. بەهەر حاڵ ئەوە بووە بارودۆخی ناوچەی پشدەر کە وا لەژێر سێبەری ئەو یاسا جوانە، یاسای

دیموکراتییەتو ئازادیخوازیدا ئەو عەشیرەتە گەورەیە بۆ ماوەیەکی زۆر بەوپەڕی ئازادیو سەربەرزییەوە ژیاونو ناوبانگی پڕ لەشانازیو سەروەرییان بۆ خۆیان بەجێ هێشتووە.

## لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی "بابانی" و "میرئاودەلی"

وەکو خۆم لە باپیرم حاجیڕەسووڵئاغاو هەروەها بابەکری سەلیمئاغا(بابەکرئاغای گەورە) بیستوومە، میرئاودەلیەکانو بابانیەکان لەپشتەوە دەچنەوە سەریەک بنەماو هەروەها فەقێ ئەحمەدی دارەشمانەش هەر دەچێتەوە سەر ڕەچەڵەکی "میرئاوئەبداڵی گەورە"، واتە عەشیرەتی میرئاودەلی. بەڵام بەڕاستی بۆمان ساغ نەبۆتەوە داخۆ بە چەند پشت دەگەنەوە یەکتر. دیسانەوەش لێمان روون نییە کە داخۆ بنەماڵەی بابانیو میرئاودەلی تاچەند لەیەکەوە نزیکن. جارێکیان برای بەڕێزو نووسەری بەناوبانگ کاک جەمال بابان پێش ئەوەی ئەم یادداشتە چاپ بکرێت، هاتەلام. هەر هەمان پرسیاری لێکردم کەئایا بابانیەکانو عەشیرەتی میرئاودەلی تا چەند لەیەکەوە نزیکن؟ منیش وەکوو هەمیشە نووسیومە، وەڵامم ئەوەبوو کە بەڵام لەناو ئێمەدا واتە ناوچەی پشدەرو رانیەدا باسدەکرێتو لە پیرو پێشینیەکانی خۆیان بیستوویانە، کاکەمیرو کاکەشێخ دووبرا بوونو لە ڕەچەڵەکی میرئەبداڵی گەورەو لە شارۆچکەی "مەرگە" دانیشتوون. هەردووکیان بەخەنجەر یەکتریان کوشتووە. گۆیا منداڵێکی نێرینە کە ئەوکاتە شیرەخۆرە بووە، لەپشتی کاکەمیر بەجێماوەو دایکی هەڵیگرتووەو بردوویەتە گوندی "خدران" لەناوچەی بیتوێن. ئەو کوڕە ناوی ئەحمەد بووەو پاش ئەوەی گەورە بووە، دایکی هێناویەتی بۆ ناوچەی پشدەرو لە گوندی "دارشمانە" نیشتەجێ بووە. لەوێ بە ئەحمەد خدران ناویان بردووە. گۆیا ئەحمەدخدران ژنێکی ئەورووپی هێناوە کە ئەویش چیرۆکێکی دوورودرێژەو زۆر لە نووسەرانو رۆشنبیران ئەوەیان بیستووەو پێویست ناکات لەو چەند دێڕەدا باسی بکەم. ئەوجا ئەحمەد خدران دەستی بە خوێندن کردووەو ناوەکەی گۆڕاوە بە فەقێ ئەحمەدی دارشمانەو کوڕێکی هەبووە بە

ناوی میرسلیمان‌و له قه‌لاچوالانی نزیک سلیمانی ئه‌ماره‌تیکی بچووکیان دامه‌زراندووه. بابانیه‌کان له ره‌چه‌له‌کی میرسلیمانن. هه‌روه‌ها فه‌قی ئه‌حمه‌د کوریکی‌تریشی به ناوی میربوداغ هه‌بووه‌و له‌گوندی "گردبداخ"ی پشده‌ر دانیشتووه. ئه‌و گونده نزیکی شاری قه‌لادزه‌یه‌و ئیستەش هه‌ر به‌و ناوه ماوه‌ته‌وه.

جاریکیان کاک مه‌سعوودمحه‌مه‌د جه‌لیزاده بۆی گیرامه‌وه که‌وا بنه‌ماله‌ی ئه‌وانیش هه‌ر له‌گه‌ل میرئاوده‌لیه‌کان بوون وله "جزیره ئیبن عومه‌ر"ه‌وه به یه‌که‌وه هاتوونه ناوچه‌ی پشده‌رو داوای لیکردم که له یادداشته‌که‌ی خۆمدا تۆماری بکه‌م. هه‌ر به قسه‌ی ئه‌و و گۆیا جه‌لیزاده‌کان له گوندی "بیگلاس"ی ناوچه‌ی پشده‌ر نیشته‌جی بوون‌و پاش چه‌ندین سالان ئه‌وجار هاتوونه‌ته شارۆچکه‌ی کۆیه.

## نووسەر لەچەند دێڕێکدا

* هەرچەند خۆی لە رەچەڵەکی ئاغاکانی میرئاودەلییە، بەڵام هەرگیز پشتیوانی لە دابو نەرتی ئاغایەتی نەکردووە، بەڵکوو هەمیشە دژیشی وەستاوە. زۆرجارانیش بەو هۆیەوە کەوتۆتە بەر تانەوتوانجی خزمو عەشیرەتەکەی خۆی.

* هەمیشە لەو بیروباوەڕە دابووە کە کێشەی گەلەکەی گەلی کوردستان، کێشەیەکی رەوایەو دەبێ هەموو مرۆڤێکی نیشتمانپەروەری کورد بەرگریو فیداکاری بۆ بکات، هەر لە تەمەنی لاویدا چۆتە ناو ریزی بزووتنەوەکانی نیشتمانی.

* لە چلەکاندا پەیوەندی بە حیزبی "هیوا" کردووەو بۆتە ئەندامو پاشان حزبی"ژک"و هەروەها کاتی کۆماری مەهاباد لە بەرکانی شەڕدا بەشداری کردووە. نووسراوەی رەسمیو خەلاتی تایبەتیو رێزلێنانی لە لایەن هەردوو شەهیدانی مەزنو سەربەرز پێشەوا قازی محەممەدو ژنراڵ محەممەد حوسین خان (سەیفی قازی) وەرگرتووە.

* لە کاتی کۆماری کودستان لە ساڵی ١٩٤٦زۆرهەوڵی داوە بۆ خوێندن لە ئەکادیمیای سیاسیو عەسکەری بچێتە "باکۆ"و هەموو پێداویستییەکانیشی لە لایەن پێشەوای شەهیدەوە بۆ ئەو سەفەرە بۆ جێبەجێ کراوە. بەڵام باوکی هاتووەو نەیهێشتووە بچێتە سەفەر.

* هەر لە ساڵی ١٩٥٠دا بۆتە ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقو هەروەها لە یەکەم رۆژی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوولی مەزن لەساڵی١٩٦١دا چەکی پێشمەرگایەتی کردۆتە شانو لە یەکەم بنکەی پێشمەرگە کە ئەویش لە گوندی "دری"ی ناوچەی ماوەت دەستی بەکار کردووە.

* لەسەرەتای ساڵی ١٩٦٢ بۆتە لێپرسراوی عەسکەری لە ناوچەکانی "شارباژێڕ"و لە رزگار کردنی هەموو ناوچەکانی شارباژێڕو پێنجوێن دەوری سەرەکی هەبووە. لەکۆتایی هەمان ساڵدا کراوەتە فەرماندەی هێزی سەفین.

* لە١٩٦٢/٦/٢٥ لەشەڕێکی خوێناویدا لە بەرەی "هەیبەسوڵتان" بریندار بووەو بۆ چارەسەری برینەکەی ناردراوەتە دەرەوە. هەر بەو زامەشەوە چاوی چەپی لە دەست داوە.

* لە ساڵی ١٩٦٤دا بە فەرمانی تایبەتی سەرۆک بارزانی نەمر کراوەتە فەرماندەی هێزی باڵەک لە ناوچەی باڵەکایەتی ( گەلاڵە).

* هەرگیز نەیویستووە خۆی بۆ ئەندامەتی لە کۆمیتەی ناوەندی پارتی بپاڵێوێت‌و خۆی بە کاروباری سیاسییەوە ببەستێتەوە، هیچ جارێک لە کۆبوونەوەو کۆنگرەکانی پارتیدا بەشداری نەکردووە.

* لە هەموو کۆبوونەوەکانی عەسکەریدا بەشدار بووەو بیروبۆچوونەکانی خۆشی بەبێ پێچ‌و پەنا دەربڕیون.

* ساڵی ١٩٦٥ بۆتە فەرماندەی هێزی تایبەتی(قوات‌الخاصە)واتە هێزە تایبەتیەکەی خودی سەرۆک بارزانی نەمر.

* لە ساڵەکانی ١٩٦٥ هەتا کۆتایی ساڵی ١٩٧٥ خۆی وەک فەرماندەی هێز لە هەموو شەڕەکانی "هندرێن" و "زۆزک" و "گەرووی عومەرئاغا" و"چیای کۆرەک" بەشدار بووە.

* دوای رێککەوتنەکەی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ کراوەتە ئامرفەوجی "حەرەس حدوود" بە ناوی فەوجی(١٠) دەی باڵەک.

* ساڵی ١٩٧١ کراوەتە ئەندامی مەکتەبی عەسکەری جگەلە ئیش‌و کاری ئامرفەوجیەکەی خۆی کە هەیبووە.

* له ساڵی ۱۹۷۲ لەسەرداوەتنامەیەکی لێژنەی مەرکەزی حیزبی شیوعیی سۆڤیەت‌و بە فەرمانی سەرۆک بارزانی نەمر لەگەڵ چەند برادەرێکی لێپرسراوی سیاسی‌و عەسکەری رۆیشتۆتە روسیاو لە شارەکانی مۆسکۆ، لینین‌گرادو ناوچەکانی سەر دریای رەش‌وهەروەها هاوینە هەوارەکانی "قەفقاش" بۆ ماوەی ۳ مانگ‌و نیو ماوەتەوە و میوانی تایبەتی لێژنەی مەرکەزی حیزبی شیوعی رووس بوون.

* ساڵی ۱۹۷۷ کاتێ پەناهەندە بوون لەتاران واتە پاش روودانی کارەساتەکەی شۆڕشی ئەیلوولی مەزن، ئەوکاتە کراوەتە لێپرسراوی لێژنەی کاروباری پەناهندەکانی کورد لە ئێران.

* لەساڵەکانی ۱۹۷۲ و ۱۹۷٦دووجاران بۆ چارەسەریی نەخۆشی رووی کردۆتە لەندەن.

* لە۱۹۷۹/۸/۲۰ واتە پاش کۆچی دوایی سەرۆکبارزانی نەمر وازی لە هەموو کارو کردەوەیەکی سیاسی هێناوەو گەڕاوەتەوە خاکی عێراق‌و یەکسەر چۆتە "حەج"و ئەو واجبە ئایینی‌یەی خۆی بەجێ هێناوەو وەکو باوەڕدارێکی موسوڵمان.

## نووسینەکانی نووسەری ئەم یادداشتانە

* لەساڵەکانی ١٩٥٩ و ١٩٦٠ دا لەرۆژنامەی "خەبات"ی پارتی دیموکراتی کوردستاندا نووسینیھەبووە.

* لە ساڵەکانی ١٩٨٠ لە گۆڤارەکانی رەنگینو کاروان کە ئەوکات لەلایەن بەرێوەبەرایەتی رۆشنبیری بە زمانی کوردی لەبەغدا دەردەچوون، بابەتی بڵاو کراوەتەوە.

* یادداشتی هەیە دەربارەی کۆماری کوردستان لە مەهابادو بە مەرجێ خۆی بەشداری کردووە لەبەرەکانی شەڕداو ئەو یادداشتانە لەکوردیەوە وەرگێڕداونەتە سەر زمانەکانی عەرەبی و ئینگلیزی.

* چەند بەرگ یادداشتی هەلە لە سەر شۆڕشی ئەیلوولی مەزن کەوا خۆی بەشداری تێداکردووەوەکو لێپرسراوی هێزەکانی پێشمەرگە و بەرگی یەکەمی ئەو یادداشتانەش بە کوردیو عەرەبی و ئینگلیزی چاپو بڵاوکراونەتەوە.

* یادداشتی بەرگی دووهەمی شۆڕشی ئەیلوولی مەزن ئامادەیە بۆ چاپکردن، بەڵام بەداخەوە چەند ریگرێک هەیە سەبارەت بە چاپکردنی

* یادداشتێکی هەیە لە سەر شۆڕشی سمایل ئاغای سمکۆ لە بەغدا لە ساڵەکانی ٩٠ چاپ کراوە.

* کوڕاسەیەکی هەیە دەربارەی ژیانی خەڵکی کوردستان پێش ساڵەکانی ١٩٧٠ ئەویش چاپ نەکراوە

* کوڕاسیەکیتری دەربارەی شۆڕشی شێخ عوبەیدوللای نەهری لە ساڵی ١٨٨٠ دژی هەردوو رژێمی ئێران و تورک هەیە، تا ئێستا چاپ نەکراوە.

* کاتێ پەناهندە بووە لە ئێران، ساڵەکانی ١٩٧٨ و ١٩٧٩ زۆر نووسینی فارسی هەبووە لە رۆژنامەکانی "کەیهان" و ئیتلاعات" دا سەبارەت بەو درۆو هەڵبەستانەی کە لەلایەن چەند ئاخوندێکی توندڕۆی وەک "خەڵخاڵی" و

"جەلالەدینیفارسی" ئاراستەی پەناهندەی کوردی دەکردو بە شاپەرەست ناویان دەبردن‌و هەروەها خولێخۆشبوو قاسملووش زۆرجاران لە رۆژنامەکاندا پەناهندەی کوردی خستە ژێر پلارو بوختان. نووسەر لەو رۆژناماندا وەڵامی داونەوە.

* ئێستەش پێنج بەرگی ئامادەکراوی هەیە بۆ چاپکردن دەربارەی شۆڕشی ئەیلوولی مەزن بەڵام بەداخەوە بارودۆخی ناوخۆ و هەل و مەرجی سیاسی ئەمڕۆی هەرێمی کوردستان ئەو بوارەمان بۆ ناڕەخسێنێت کە هەموویان چاپ بکرێن.

# شجرة رقم (١) عشيرة ميد القادمون من جزيرة ابن عمر




**كان حمد أغا له (١٧) زوجة و المعلوم حالياً إسم (١٥) من أبناء حمد أغا الكبير ... و تم التعرف عليهم حسب نسب الأم/ ويسمى كل منهم بأسم اخير الاكبر هذه الشجرة تحتوي أسماء الابناء الغاية الظهر الخامس**

## شجرة رقم (٢) أبناء حمد آغا و هم من أم واحدة و يدعون طائفة رسول آغا




**هذه الشجرات تحتوي على اسماء الابناء لغاية الظهر الخامس فقط وذلك لتعذر**

**كتابة اسماء الباقين كونهم كثيرون و من الجيل المعاصر**

## شجرة رقم (٣) أبناء حمد آغا الكبير حسب نسب الأم (طائفة بابكر آغا)

## بابكر آغا هو الابن الاكبر لأولاد حمد آغا




**هذه الشجرات تحتوي على اسماء الابناء لغاية الظهر الخامس فقط وذلك لتعذر**

**كتابة اسماء الباقين كونهم كثيرون و من الجيل المعاصر**

## شجرة رقم (٤) من أبناء حمد آغا الكبير حسب نسب الأم ( طائفة احمد آغا)

### حمد آغا الكبير




هذه الشجرات تحتوي على اسماء الابناء لغاية الظهر الخامس فقط وذلك لتعذر

كتابة اسماء الباقين كونهم كثيرون و من الجيل المعاصر

## شجرة رقم (٥) من أبناء حمد آغا الكبير حسب نسب الأم ( طائفة احمد آغا)




**هذه الشجرات تحتوي على اسماء الابناء لغاية الظهر الخامس فقط وذلك لتعذر**

**كتابة اسماء الباقين كونهم كثيرون و من الجيل المعاصر**

## شجرة رقم (٦) طائفة هباس هباس آغا من أبناء حمد آغا الكبير




**هذه الشجرات تحتوي على اسماء الابناء لغاية الظهر الخامس فقط وذلك لتعذر كتابة اسماء الباقين كونهم كثيرون و من الجيل المعاصر**

## شجرة رقم (٧) طائفة هباس هباس آغا من أبناء حمد آغا الكبير




**هذه الشجرات تحتوي على اسماء الابناء لغاية الظهر الخامس فقط وذلك لتعذر كتابة اسماء الباقين كونهم كثيرون و من الجيل المعاصر**

## شجرة رقم (٨) طائفة علي الكبير من أم واحدة




**هذه الشجرات تحتوي على اسماء الابناء لغاية الظهر الخامس فقط وذلك لتعذر كتابة اسماء الباقين كونهم كثيرون و من الجيل المعاصر**

## شجرة رقم (٩) طائفة هومر آغا لحمد آغا الكبير




**هذه الشجرات تحتوي على اسماء الابناء لغاية الظهر الخامس فقط وذلك لتعذر كتابة اسماء الباقين كونهم كثيرون و من الجيل المعاصر**

ژماره [illegible]

بەروار [illegible]



# حزب دەموکراتی کوردستان

آغای احمد آغازاده عبدالرحمٰن

ەتکه پشت له احساسات ایوه ممنونم. ئەو کاغذەی وا اشارت

فرمەیو پیم گەیوه جوابیشی تقدیم کراوه ٠ –



لە ساڵی ١٩٤٥دا کەوتمە ناو کوردایەتی، هەستی کوردایەتی و نیشتمان پەروەری کەوتە ناو مێشکمەوەو باوەڕم هاتە سەر ئەوە کە دەبێ لاوی کورد ئامادە بێت و لە کاتی پێویستیدا گیانی خۆی بۆ وەدەست هێنانی ئازادی و سەربەستی نیشتمانەکەی بەخت بکات. ئەو کاتە بوو کە لە حیزبی هیوادا بە ئەندام وەرگیرام. لە ساڵی ١٩٤٦دا ئاڵای کوردستان بە ناوی کۆماری مەهاباد لە کوردستانی ئێران بەرز کرایەوە و بڕیارم دا خۆم بەشداری ئەو خەباتە بکەم.

MAZHAR